**سەرچاوەکانی ئەم وەرگێڕانە:**

**Pandemics: A Very Short Introduction, 1st Edition**
**by Christian W. McMillen**




بڵاوکراوەکانی دەزگای رۆشنبیریی
جەمال عیرفان ۲۰۲۲

زنجیرە: (۱۱۲)

بەڕێوەبەری دەزگا:
سیروان حەمەسەعید حەمەخورشید

Tel: 0533202936 07701549509
email: jamalerfan99@gmail.com

jamal erfan cultural foundation
www. jamalerfan.com

ناونیشان: سلێمانی، شەقامی سالم، بەرامبەر ماکسی مۆڵ



# پانەپەتاکان پێشەکییەکی زۆر کورت

نووسەر: کریستیان و مەك مێللن

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: محەمەد میکائیل نادر

دیزاینی ناوەوە: ئومێد محەمەد

دیزاینی بەرگ: ئارام عەلی

نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم: ٢٠٢٢

تیراژ: ٥٠٠ دانە

نرخ: ٥٠٠٠ دینار

چاپ: چاپخانەی تاران

# پێڕست

## پرۆژەی وەرگێڕانی زنجیرە کتێبەکانی زانکۆی ئۆکسفۆرد

زیاتر لە ٢٥ ساڵ بەر لە ئیستا، ساڵی ١٩٩٥، زانکۆی ئۆکسفۆرد، کە دامەزراوەیەکی دیاری دنیای ئەکادیمی و جیهانە بە گشتی، دەستی بە پرۆژەیەکی گرنگ کرد. پرۆژەکە پێکهاتووە لە زنجیرە کتێبێکی کورت و پوخت و زانستی لە تەواوی بوارە جیاوازەکاندا: لە پرسی تیرۆرەوە بۆ کەشوهەوا، ئابووری کۆن و نوێ و پرسی جیهانگیری. لە فەلسەفەی پێش سوکراتەوە بۆ مۆدێرن و پۆست‌مۆدێرن. لە مێژووی کاتەوە بۆ مێژووی جیهان، لە فیزیکی کۆنەوە بۆ کوانتەم و دنیای دیجیتاڵ و ئایندەی مرۆڤ. لە بوونناسیەوە بۆ ئایینناسی و مێژووی ئایینەکان و پرسی ئیسلام و ئەندازیاری و ماتماتیک. لە ئەفسانەناسییەوە بۆ ئەدەبناسی و تیۆر و ڕەخنەی ئەدەبی... پرۆژەکە خۆی بە یەک بوارەوە نەبەستۆتەوە، بەڵکو دەستی بۆ تەواوی بوارە جیاوازەکان بردووە، ئەمەش لە بێ پلانی و هەڕەمەکییەوە نییە، چونکە بێ پلانی لە زانکۆیەکی پلانسازی وەک ئۆکسفۆرد ناوەشێتەوە.

سروشتی ئەم زنجیرە کتێبانە، بریتییە لە زانستیبوون، کورتی و پوختی و چڕی و ئێستاییبوون، کە هەموو کتێبەکان لەلایەن کەسانی پسپۆر و شارەزای بوارەکان لەسەر ئاستی جیهان نووسراون. خوێنەر کاتێک بەر هەر بەرهەمێک لەم پرۆژەیە دەکەوێت، دەزانێت چەند هارمۆنی و سادەقووڵ نووسراون. خاڵێکی درەوشاوەتر، بریتییە لە خوێندنەوە و شیکاری ڕووداوەکانی هەنوکە، واتە کتێبەکان تەنیا هۆنینەوەی چیرۆکی ڕابردوو نین، بەڵکو شیکاری دۆخی ئێستای جیهان و مرۆڤ دەکەن.

ئۆکسفۆرد لە ١٩٩٥ تا ٢٠١٨ زیاتر لە ٦٠٠ کتێبی لەم زنجیرەیە بڵاوکردۆتەوە؛ سەرەتای هەر مانگێک کتێبێکی نوێیان بڵاوکردۆتەوە. بەهۆی بایەخی نەبڕاوەی پرۆژەکەوە، زنجیرە کتێبەکان بۆ زیاتر لە ٢٥ زمانی دنیا وەرگێڕاون، وا ئێستا زمانی کوردیش دەیەوێت ببێتە یەکێک لەو زمانانەی ئەم پرۆژەیە لە ئامێز دەگرێت. دەستبردن بۆ وەرگێڕان و لە ئەستۆگرتنی ئەم کارە، بەرپرسیارێتییەکی مێژوویی و ئەکادیمی گرنگە، کە دەزگای جەمال عیرفان بە سپۆنسەری (د. تەها ڕەسوڵ) ئەنجامی دەدەن. وابڕیارە هەر سێ مانگ جارێک ١٠ بۆ ١٥ کتێب لە زمانی یەکەمەوە لە ڕێگەی وەرگێڕی شارەزاوە بڵاوبکاتەوە. ئەمە پرۆژەیە و پرۆژەش بە دڵنیاییەوە قۆناخێکی مێژوویی لە بزاڤی ڕۆشنبیری و کتێبخانەی کوردیدا بۆ خۆی دروستدەکات، بەهیواین ببێتە داینەمۆی دروستکردنی نەوەیەکی نوێی بەرپرسیار و هۆشیار.

**سەرپەرشتیاری پرۆژە**
**هەرێم عوسمان**

## سوپاس و پێزانین

پێش چەند ساڵێک، من و نانسی تۆف لە زانکۆی ئۆکسفۆرد یەکترمان بینی و گفتوگۆمان دەربارەی ئەگەری ئەنجامدانی چەندین پڕۆژەی جیاواز کرد. من ئەو کات لە کاری چروپڕدا بووم لەسەر پەرتووکێک دەربارەی نەخۆشی سیل. نووسینی ئەو پەرتووکە وای لێکردم بە شێوەیەکی فراوانتر بایەخ بە بڵاوەپەتاکان بدەم. بۆ هەردووکمان مایەی سەرسوڕمانبوو، کاتێک نانسی بۆی دەرکەوت کە هیچ پەرتووکێک لە زنجیرەی پێشەکییەکی زۆر کورت نە دەربارەی بڵاوەپەتاکان و نە پانەپەتاکان نییە. لەوانەیە من بتوانم ئەو پەرتووکە بنووسم؟ بە هاوکاری نانسی توانیم بیکەم. سوپاس، نانسی.

هەروەها سوپاس بۆ ئێڵدا گرانتا لە زانکۆی ئۆکسفۆرد کە زۆر بە پەرۆشبوو بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارگەلێکی بێشومار، ئەو کارکردنی گۆڕی بە خۆشی و کەیفکردن.

سوپاسی خوێندکارانم دەکەم، لە وانەکانم دەربارەی بڵاوەپەتاکان، پانەپەتاکان و مێژوو بۆ تاقیکردنەوەی ئەم بابەتانە لەسەریان بە بێ ئاگاداری خۆیان.

ئەم پەرتووکە ئامادەکراوە لەسەر بناغەی خەباتی دژواری چەندین مێژوونووس و تەرخانکراوە بۆ ئەوەی نەخۆشی بکات بە چەق لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، منیش سوپاسم هەیە بۆیان.

لە کۆتاییدا، هاوسەرەکەم ستێڤانی و منداڵەکانمان مایا و ئۆلیڤ، وەکو هەمیشە شایەنی هەموو سوپاسێکن.

## پێشەکی

ئەم پەرتـــووکە خـــوێنەران ئاشـــنا دەکـــات بە مێـــژووی دەوڵەمەندی بڵاوەپەتا و پانەپەتاکان.

هەروەهـا ئەوە دەخـاتەڕوو کە زۆرێک لە ئەو ڕێگایانەی ئێسـتا ئـێمە پێـی ڕووبەڕووی ئەو نەخۆشـیانە دەبینەوە لە ڕابردوودا دروستبوون. ئەم خستنەڕووە زۆر سەرنجڕاکێش نیـیە، بەڵام زۆر گـرنگە. زۆربەی کـات مێـژووی پەتاکـان لەبیردەکرێت یـان بە تەنهـا ئەو کاتـانەی کە خۆمـان توشـی بڵاوەپەتـــا و پانەپەتـــا هاوچەرخەکـــان دەبیـــنەوە، بیـــری لێدەکەینەوە، کە لە ئەم سـەردەمەدا ئەم بەشـەی مێژوو بـێ هەژمار دووبارە دەبێتەوە.

پانەپەتا (pandemic) یان بڵاوەپەتا(epidemic) چییە؟

بڵاوەپەتـا (epidemic) بە شـێوەیەکی گشـتی بـریتییە لە دەرکەوتنێکی بەرفراوان و چاوەڕواننەکراوی نەخۆشـیەک لە کاتێکی دیاریکراودا.

پانەپەتـــا (pandemic) بـــریتییە لە بڵاوەپەتـــایەکی زۆر گەورە.

ئیبۆلا لە ساڵی ٢٠١٤ بە هەموو پێوەرەکان بڵاوەپەتـابوو، تەنانەت پانەپەتاشبوو.

ئەو ئەنفلۆنزایەی کە لە ساڵی ١٩١٨، ٥٠ ملیۆن کەسـی لە سەرانسەری جیهاندا کوشت، پانەپەتابوو.

شـێوازی بیرکـردنەوەی بـاو دەربـارەی پەتـا ئەوەیە کە ڕووداوێکی کاتییـە دێـت و پاشـان نامێنێت. بەڵام گەر بە ئەم شێوەیە بیری لێبکەیەنەوە، ئایا دەتوانین بە نەخۆشـی HIV/ ئایـدز بڵێـین پانەپەتـا؟ یـان بە سـیل؟ ئـەی چـی دەربـارەی مەلاریا؟ پانەپەتا دەکرێت ڕووداوێکی دوابڕاو بێت یان وەکو

ئەوەی من دەمەوێت ناوی لێبنێم پانەپەتای بەردەوام. سیل، مەلاریا، HIV/ئایدز کە کاریگەرییان لەسەر ڕووبەرێکی بەرفراوان لە جیهاندا هەیە و ساڵانە ملیۆنان کەس دەکوژن، پانەپەتایەکی بەردەوامن.

لە ساتەوەختی پانەپەتای ئەنفلۆنزای H1N1 لە ساڵی ٢٠٠٩، مشتومڕێک دروستبوو، دەربارەی ئەو پێناسەیەی پانەپەتا کە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) و ئەوانی دیکەوە بەکاردەهات، لە ئەنجامدا چەند پسپۆڕێکی نەخۆشیە گوێزراوەکان لە پەیمانگای نیشتمانی هەستیاری و نەخۆشییە گوێزراوەکان سەر بە پەیمانگای تەندروستی نیشتمانی(NIH) گەشتن بە چوارچێوەیەکی گشتگیر کە دەیتوانی کاربکات بۆ پێناسەکردنی پانەپەتا کە چییە و چی دەبێت. ئەوەیان خستەڕوو کە پانەپەتا دەبێت ئەم هەشت مەرجەی تێدابێت:

*گرتنەوەی ناوچەیەکی جوگرافی بەرفراوان.

* گواستنەوە و جووڵانی نەخۆشیەکە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە.

*زۆر توشکردن و تەقینەوەی نەخۆشییەکە.

*سنووررداری بەرگری لەشی خەڵکی بۆ نەخۆشییەکە.

*نوێی و تازەیی نەخۆشییەکە.

*فرە توندی نەخۆشییەکە.

*گرتنی نەخۆشییەکە بە هۆی وردە زیندەوەرەوە.

*گرتنی نەخۆشییەکە لە دەوروبەر و کەسانی دیکەوە.

لەوانەیە وا دەربکەوێت کە سیل و HIV/ئایدز نوێ نەبن، بەڵام خۆ تایبەتمەندییەکانیان دەگۆڕێن، سیل بۆ نموونە لە ناوچەیەک خراپ دەبێت و لە ناوچەیەکی دیکە باشبوون بە

خــــۆوە دەبينێـــت، ســــيلی بەرهەڵســـتكاری دەرمــــان كە دەردەكەوێت وەكو دووبارە نوێبوونەوەيەكە بۆ سيل؛ هەر ماوەيەک و نوێبوونەوەيەک.

مەلاريـا گۆڕانكـاری بەسـەردا هـات كاتێـک ڕێكخـراوی تەندروســـتی جيهـــانی(WHO) لە ســـاڵانی دەيەی ١٩٥٥ ويسـتی ڕيشەكێشـی بكـات، گۆڕانكـارييەكی نـوێی ديـكە لە سـاڵانی دەيەی ١٩٧٠ و ١٩٨٠ كاتێـک بـانكی جيهـانی بـوو بە ياريكەری سەرەكی لە تەندروستی جيهانيدا. بە هەمان شێوە HIV/ئايدز بەدرێژايی كات چەندين شێوازی وەرگرتـووە، بە جۆرێــک چەنــدين پێناســـەی بــۆ كــراوە. هەريەک لە ئەو پێناسانە بە پێی مێژوو گۆڕاون:

بڕيـــاری مەرگ، نەخـــۆش كـــەوتنێكی درێژخــــايەنی جڵەوكــراو، نەخۆشـــی هاوڕەگەزخوازەكـــان، نەخۆشـــی داوێنپيسان.

زۆر بـابەت و سـەرباس هەن كە بەسـتراون بە مێـژووی بڵاوەپەتا و پانەپەتاكان.

پێناســـی هەر نەخۆشــيەک گۆڕانكـــارييەكی گەورەی بەسەردا هاتووە لە ئەنجامی شۆڕشی تاقيگەيی كۆتاييەكانی سـەدەی نـۆزدە، ئەو شۆڕشـەی پێشـڕەوی ئەو پزيشـكييە هــاوچەرخەی كــرد كە لە ئێســـتادا هەيە. ديــارە بە لــويس پاستور لە فەڕەنسا دەستپێكرد و لەگەڵ كارەكانی ڕۆبەرت كـــوخ لە ئەڵمانيـــا گەشـــتە ترۆپـــک، ئەمەش واتـــا ئەو نەخۆشـــييانەی كە جـــاران بە شــــێوازی جۆراوجــــۆر لێكـــدانەوەيان بـــۆ دەكـــرا، ئێســـتا و بـــۆ هەميشـــە يەک لێكـــدانەوەيان بـــــۆ دەكرێـــت. دەرهاويشـــتەكانی ئەم گۆڕانكـــارييەش ناكرێـــت زۆر قســـەی لەســـەر بكرێـــت.

دۆزینەوەی بەکتریا وەکو هۆکاری نەخۆشی سیل ئەوە دەگەیەنێت کە لێکدانەوەکانی سەدەکانی پێشوو بۆ هۆکارەکانی نەخۆشی سیل ون دەبێت. بۆ یەکەمین جار زانستی پزیشکی بەتەواوەتی دەیزانی چی دەبێتە هۆی نەخۆشییەکی دیاریکراو. بۆیە ئێستا نەخۆشییەکان لەوانەیە بە تەواوەتی بێنە چارەسەرکردن.

دۆزینەوەی بەکتریای (bacilluc tubercle) و ئەو بەکتریایەی کە دەبێتە هۆی تاعوون ڕێگەی بە پزیشکیدا بۆ پەرەپێدانی چارەسەری کاریگەر، هەروەها تێگەشتن لە ئەوەی چۆن پێشبگرن بە نەخۆشییە گوێزراوەکان. شۆڕشی تاقیگەیی متمانەیەکی ئێجگار زۆری چاند بە توانای پزیشکی زیندەیی بۆ ڕزگارکردنی جیهان لە نەخۆشییە گوێزراوەکان و ئەو بڕوایەی بەهێزتر کرد کە ڕێگاچارەکان زیاتر پێویستە پشت بە پەلاماردانی هۆکارەکانی نەخۆشی ببەستن، بەراورد بە پەلاماردانی ئەو بارودۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتییانەی کە هەر لە سەرەتاوە بوونەتە هۆی دەرکەوتنی نەخۆشییەکە. ئەمەش ئاماژەی تێدایە بۆ بابەتێک ئەویش بریتییە لە پەیوەندی نێوان هەژاری و نەخۆشییەکان، هەروەها پەیوەندی جوگرافیا بە بڵاوەپەتا و پانەپەتاکان.

سەرجەم ئەو نەخۆشییانەی کە لە ئەم پەرتووکەدا باسکراون، هەر چەندە دەتوانرێت بە (ڕێژەی جیاواز) لە ڕێگەی پزیشکی هاوچەرخەوە جڵەوبکرێن، بەڵام کاریگەرن بە بارودۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتیەکان. هەر ئەم هۆکارەیە، کە زیاد لە سەدەیەک پێش ئێستا و بە هۆیەوە کۆلێرا لە ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا نەما، بەڵام لە زۆرێک لە وڵاتە تازە پێشکەوتووەکان هەر بەردەوامە، یان

HIV/ئایدز کە بەشێوازێکی نا بەرامبەرانە کاردەکاتە سەر ولآتانی باشووری بیابانی گەورەی ئەفریقا، هەروەها تاعوون کە توشی هەزارن زیاتر لە دەوڵەمەندان دەبوو بە تایبەت لە بڵاوەپەتای شاری مرسیلیا لە ساڵی ۱۷۲۰. هەندێک شوێن ئەو بارودۆخانە تێدەپەڕێنن کە ڕێگە بە گەشانەوەی نەخۆشیەکان دەدەن، بەلآم هەندێک ناوچەی دیکە بە ئەو شێوەیە نین.

لە ئەم سەردەمەدا، زۆرێک لە ئەو ناوچانەی کە پەتای بەردەوامیان هەیە، پێیان دەوترێت جیهانی باشوور. هەروەها باری بڵاوەپەتاکان گۆڕاوە. سیل، کە لە ئەوروپا هۆکاری سەرەکی مردنبوو، ئەوە نەبێ ئێستا سیل لە زەویدا نەمابێت، بەڵکو بە ئاسانی بیڵێین تەنها باریکردووە. سیل لە ڕۆژئاوا بە کاتێکی زۆر پێش دەرکەوتنی چارەسەری کاریگەر یان هۆکارەکانی خۆپاریزی، پوکایەوە. ئەمەش بەهۆی دەستوەردان لە تەندروستی گشتی بە دابڕاندنی توشبووان(Quarantine) و باشترکردنی شێوازی ژیان بە شێوەیەکی گشتی. سیل لە ولآتە تازە پێشکەوتووەکان بە شێوەیەکی بەرفراوان زیادیکرد، تەنانەت پاش دۆزینەوەی دژە زیندەییەکان_کە یەکێکە لە سەرکەوتنەکانی پزیشکی زیندەیی_کە بە تەواوەتی بەکتریاکە دەکوژێت و نەخۆشەکەش چاکدەکاتەوە. ڕوودانی ئەمەش بە هۆی بوونی ئەو بارودۆخانەوەیە کە وا دەکات بەکتریاکە بگەشێتەوە، وەکو: نا یەکسانی لە دەستکەوتنی دەرمان و گرانی نرخی دەرمان، ژیانکردنی قەرەباڵغ، زۆری ڕێژەی توشبوون، هەروەها لەگەڵ ئەوانی تریشدا بوونی نەخۆشی هاوەڵ وەکو HIV /ئایدز.

کەواتە سیل پوکاوەتەوە لە هەندێک ناوچەی جیهان بە بێ دەستێوەردانی پزیشکی زیندەیی و لە هەندێک ناوچەی دیکەی هەسارەکە سەرەڕای دەستێوەردان زیادیکردووە. بەڵام هیچ لە ئەم قسانە واتای ئەوە نییە کە دەرمانەکان و توێژینەوە پزیشکیەکان بۆ جلەوکردنی پەتاکان پێویست نین، بە دڵنیاییەوە پێویستن.

چارەسەر بە دەرمانە دژەکانی ڕیترۆڤایرۆس(therapy antiretroviral) بە هەموو پێوەرێک دۆزینەوەیەکی نایاببوو، کە لە ڕێکارە بنەڕەتییەکانی ڕووبەڕووبوونەوەی HIV/ ئایدز بوو. بەڵام تا ئێستاش دەستکەوتنیان ڕێکوپێک نییە، هەروەها توشبوون لە هەندێک وڵات لە بەرزبوونەوەدایە. هەر لە کاتی ئەم دۆزینەوەیە لە ساڵانی دەیەی ١٩٦٠ تاکو ئێستا، چارەسەرکردنی کۆلێرا تەنها بە ئاوپێدان لە ڕێگەی دەمەوە دەبێتە هۆی پاراستنی ژیانی توشبووەکە. بەڵام هیچ ناوترێت دەربارەی ئەوەی کە بۆچی ملیۆنان کەس لە جیهانی باشووردا ئاوێک دەخۆنەوە کە بە پاشەڕۆی مرۆڤ پیسبووە.

خاڵە گرنگەکە بریتییە لە ئەوەی کە پەیوەندی هەیە لەنێوان نەخۆشی و بارودۆخە ئابووریی و کۆمەڵایەتیەکان، ئەو بارودۆخانەی کە لە هەموو شوێنێک بوونی نییە و پزیشکی زیندەییش ناتوانێت چارەسەریان بکات.

ترس و نیگەرانی تایبەتمەندی پەتاکانن. کۆلێرا ترسێکی گەورەی دروستکرد لە سەدەی نۆزدە، HIV/ئایدز بووە هۆی دروستکردنی ترس و جیاکاری لە هەندێک شوێن وەکو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ڕابردووی نزیک_تاکو ئەم سەردەمەش. تەنانەت لە ئێستاشدا

لەکەیەکی گەورە ها بە نەخۆشییەکەوە. هەروەها تاعوون لە سەدەی چواردە پاڵنەری قڕکردنی جووەکان بوو. لە سەردەمی خۆشماندا باری ترس لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ماوەی پانەپەتای ئیبۆلای ساڵی ٢٠١٤ بە جۆرێک گەورەبوو کە لەگەڵ مەترسی ڕاستەقینەی نەخۆشیەکە یەکی نەدەگرتەوە. کە چی ئەنفلۆنزا کە توانای لەناوبردنی بێ هەژمارە (پانەپەتای ١٩١٨ لایەنی کەم پەنجا ملیۆن کەسی کوشت لە کەمتر لە یەک ساڵدا)، بە دەگمەن ڕووداوەکانی پانەپەتاکەی گرنگیەکی زۆری پێدەدرێت. ترس لە هەندێک نەخۆشی ناگەڕێتەوە بۆ شێوازی دەرکەوتنی نەخۆشیەکە لە کەسەکەدا_کۆلێرا بە تەواوەتی نەخۆشیەکی بێزارکەرە، نیشانەکانی بە تەواوەتی کارەساتن، هەروەها بۆ کەسانی ناسک و نازدار قێزەون و ترسێنەرن، کە ئەمەش بارودۆخەکە خراپتر دەکات.

چۆنیەنی توشبوون بە نەخۆشییەکە: HIV/ئایدز تێکئالاوە بە شێوازی ناباوی پەیوەندی زایندەیی مرۆڤ، هەروەها زۆرێک دەزانن کە هۆکارەکانی توشبوون سەرچاوە دەگرن لە لادانی کۆمەڵایەتی، وەکو بەکارهێنانی دەرزی ماددەی هۆشبەر. شوێنی سەرهەڵدانی نەخۆشیەکە دەکرێت کاریگەری لەسەر ترسناکی نەخۆشییەکە هەبێت.

مەلاریا ئێستا زیاتر نەخۆشیەکە لە وڵاتە تازە پیشکەوتووە کەمەرەبییەکان. کاتێک جاروبار دەگاتە وڵاتانی پێشکەوتووی باکوور، وەکو داگیرکەرێکی بێگانەی توقێنەر تەماشادەکرێت. پرسیاری مەترسی توشبوون_کێ توشی نەخۆشییەکە دەبێت و بۆچی توش دەبێت_گرنگە. لە

ئەمەریکای دێرین داگیرکەران هەندێکیان بە خاکی پاکیزەی ئاوڵە و نەخۆشیەکانی دیکەی جیهانی کۆن دایان دەنا.

لە سەرەتاکانی سەدەی بیست باوەڕ وابوو کە نەژادی ڕەشپێستی باشووری ئەفریقا و ئەوانی دیکە زیاتر شیاون بۆ توشبوون بە سیل، بەڵام سپی پێستەکان دەکرێت توانای بەرگریان دژ بە نەخۆشییە گوێزراوەکان هەبێت.

کەمی مەترسی توشبوونی ئەفریقیەکان بە مەلاریا یەکێک بوو لە هۆکارەکانی ڕاگواستنیان لە لایەن داگیرکەرانەوە وەکو کۆیلە بۆ جیهانی نوێ لە سەدەی حەڤدە و نۆزدە.

بۆ سەدان ساڵ، تاکو شۆڕشی بەکتریاناسی، زۆرێک لە مشتومڕدابوون کە ئایا پەتاکان درمن یان هۆکارەکەی هەلاوی بۆگەنە(Miasma)_ئەو هەوایەی کە پیسبووە بە هۆی بۆگەنبوونی مادده ئاژەڵی و ڕووەکیەکانەوە. زۆربەی جار وا سەیری تاعوون دەکرا کە سزای تاوانە. هەموو ئەم لێکدانەوانە گۆڕانکاریان بە سەردا هات. هەموو ئەو نەخۆشییانە جگە لە ئاوڵە تاکو ئێستاش ماون. تەنها تاعوون بە نموونە بگرە کە تاکو ئێستاش هەر دەرکەوتنی هەیە_ پەتایەکی ناوچەیی هەبوو لە هیند لە ساڵانی دەیەی ١٩٩٠، هەروەها بە شێوەیەکی ڕێک بەردەوام بڵاوبوونەوەی لە وڵاتی مەدەکەشکەر هەیە _کە لە مەودا و هێزدا کورتی هێناوە. بە دڵنیاییەوە نەخۆشی نوێ لە ئاسۆدا دیارە. بە ئەم شێوەیە، هەر چەندە زۆربەی ئەم پەرتووکە مێژووییە، بەڵام بە تەنیا دەربارەی مێژوو نییە. پەیوەندی نێوان بڵاوەپەتا و پانەپەتاکان بە گەشەسەندنی دەوڵەتداریی سەردەمەوە ڕوونە.

له سـەردەمێکی سـەرەتایی وەکـو سـەدەی پـازدە، هاوشـێوەی کـاردانەوەیەک بەرامـبەر تـاعوون، شـارە دەوڵەتەکـانی ئیتاڵیـا لیـژنەی تەندروسـتی پاڵپشـتیکراو له دەوڵەتەیان پێکهێنا.

پانەپەتـای کـۆلێرا له سـەدەی نـۆزدە بـووە هـۆی وەگەڕخسـتنی هەوڵـی نەتەوەیـی بـۆ دابڕانـدن(Quarantine)_کە تەنهـا دەتـوانرا له لایەن دەسـەڵاتی ناوەنـدیەوە ئەنجامبـدرێت. هەروەهـا ڕێکارەکـانی وەکـو کوتـانی ناچـاری هەمـان پەیوەنـدی نیشـاندەدات. بڵاوەپەتـا و پانەپەتاکـان ناکرێـت ڕووبـدەن بە بـێ بـوونی دانیشتوانی چڕ و بزۆک.

هـیچ یەک له ئەم نەخۆشـیانە بە چێـوەی پانەپەتـا بەرپانەبوون و ڕوویاننەدا، تاکو نیشتەجێبوونی مرۆڤەکان بـۆ کشـتوکاڵ و دەسـتپێکردنی بازرگـانی لەگەڵ یەکدیـدا. نەخۆشـیە درمییەکـان بـۆ مانەوەیـان پێویسـتە له نێـوان خانەخوێیەکانـدا بگـوازرێنەوە. هەروەهـا دەبێـت ئەو خانەخوێیە بۆ توشبوون گونجاوبێت.

ئـاوڵە بەردەوامبـوو وەکـو کوژەرێـک له نێـو هینـدە ئەمریکییەکاندا، چـونکە توانـای هەبـوو بـۆ مـاوەی چەنـدین سەدە بۆ دەستکەوتنی دانیشتوانێک کە بەرگرییەکی لەشـی کەمیان هەبێت. هەر کە ئەو دانیشتوانە قڕبوون، نەخۆشیەکە بە شێوەیەکی سروشتی کەمیکرد.

لەگەڵ دەسـتپێکردنی سـەدەی چـواردە بازرگـانی و گەشـتکردن بە باشـی گەشەیسـەند، تـاعوونیش سـوودی له ئەمە بینی.

سیل تەنها ئەو کاتە تەقییەوە کە بارودۆخەکە ڕێگەیدا: بە تـــایبەت لە ســــەدەی هەژدە، چـــونکە شـــار و کـــارگە قەرەباڵغەکانی ئەوروپای پیشەسازی گەشەیکرد.

ئایـــدز پشـــت دەبەســـتێت بە جـــووڵەی مـــرۆڤ بە سەرانسەری جیهاندا.

کاتێـک کە پانەپەتـای ئەنفلـۆنزا بە بەشـێکی زۆری گـۆی زەویـدا لە چەنـد مـانگێکی سـاڵی ١٩١٨ بڵاوبـووەوە، ئەمە ڕوویدا تەنها بە هۆی بونیادنانی تۆڕی نوێی گواستنەوە و بازرگانی و زیادکردنی هاتوچۆ کە جەنگی جیهانی یەکەم بە دوای خۆیدا هێنـای. جێگۆڕکێی مـرۆڤ، ئـاژەڵ، مێروو بـۆ بڵاوبوونەوەی بڵاوەپەتا و پانەپەتاکان گرنگن.

لە کۆتایـــدا، خەڵکانی_شــــایەتحاڵ، ڕۆمـــاننووس و هونەرمەندان، هەروەها بیرەوەرنووسـان و سەرگوزشتەوان و دەسەڵاتدارانی حوکمی و مێژوونووس و شوێنەوارناسان و زانایـانی درمنـاس و پاشـا و شـاژنەکان و سـەرۆکەکان_ دەربـارەی بڵاوەپەتـا و پانەپەتاکـان بـۆ چەنـدین سـەدە دەیاننووسـی پەخشـکەری ئەوەی کە ئایا چـی دەبێتە هـۆی پەیـدابوونیان، چـی دەیانوەسـتێنێت، هەروەهـا کـاردانەوەی خەڵکی چی بووە بەرامبەریان.

ئێمە خـاوەنی کـۆمەڵەیەکی کەڵەکەبـووی بـێ هەژمـاری سەرچاوەی بە بەهاین، نەک تەنها بۆ مێژوونووسـان، بەڵکو ئێمە تۆمارێکی کەڵەکەبوومان لە سەرکەوتن و شکست هەیە کە پێویسـتە پاڵپشـت بـن بـۆ ئەوانەی کـاردەکەن لەسـەر بڵاوەپەتا و پانەپەتاکان.

# بەشی یەکەم

## تاعوون

لـە مێژووی نەخۆشـیدا گـرانە دۆزیـنەوەی وشـەیەک کە قوڵتر و ماناداراتربێت لە وشەی تـاعوون. تـاعوون بریتییە لە ئەو نەخۆشیەی کە هۆکارەکەی بەکتریای چیلکەیی یارسـینا پێستسـەـ(pestis Yersinia)، کە بە پێـوەدانی کێچـی توشـبوو بە بەکتریـاکە دەگـوازرێتەوە _کـێچ دەگەڕێـت بـۆ خـانەخوێی دیکـەی وەکـو مـرۆڤ پـاش ئەوەی خـانەخوێیە ئاژەڵەکەی لەناودەچێت.

تـاعوون بـۆ یەکەمـین جـار لە سـەدەی شەشـی زایینیـدا دەرکەوت، کاتێـک یەکەمـین پانەپەتـای ناسـراو لە ئیمپراتۆریەتی بیزەنتیدا ڕوویدا. لە زمانی باودا پێی دەگـوترا تـاعوونی جوسـتیان، کە لە پـاش جوسـتیانی ئیمپراتـۆری ڕۆمای ڕۆژئاوا ناونرا.

بنەچەی دەرکەوتنی تاعوون نەزانراوە_لەوانەیە لە نێو چەقی ئەفریقا لە ڕێگەی تۆڕی دامەزراوەی بازرگانی بۆ ئەسیوبیا و دواتر بۆ بێزەنتین هاتبێت. بەڵام لەوانەشە لە ئاسیاوە هاتبێت، ئێمە نازانین. یەکەمین دەرکەوتنی لە مێژووی تۆمارکراودا لە ساڵی ٥٤١ لە شارە بەندەری فەرەما لە میسر بوو. نەخۆشیەکە دوو ساڵی پێویستبوو بۆ تێپەڕبوون بە درێژی و پانی دەریای سپی ناوەڕاست و دەستی لە هیچ وڵاتێکی کەنارەکە نەپاراست، لە ڕۆژهەڵاتەوە چووە ئیمپراتۆریەتی فارس لە باکووریشەوە بۆ دوورگەکانی ئینگلستان. سەرەڕای نەبوونی ئامارێکی وردی دانیشتووانناسی، بەڵام ئەوە زانراوە کە پەتاکە کاریگەرییەکی کارەساتباری لەسەر ژمارەی مردووان هەبووە.

قەشە جۆن ئیفیسیس، لە مێژووی کڵێسەیی خۆیدا، باس لە وردەکاری دەیدەنی خۆی لەگەڵ تاعووندا دەکات، کاتێک بە ڕێکەوت گەشتی کردووە، لە ڕێگەکەیدا لە قوستەنتینەوە بۆ ئەسکەندەریە و لە گەڕانەوەشدا بە فەڵەستین، سوریا و ئاسیای بچووکدا تێپەڕبووە. زەویە کێڵدراوەکان کە تۆو نەکرابوون، باخەکانی مێو کە نەڕنرابوون، ئاژەڵەکان کە ببوونە کێوی، هەروەها ئەو خەڵکانەی کە ڕۆژەکانیان لە هەڵکەندنی گۆڕدا بەسەردەبرد ئەم تۆماریدەکردن.

مێژوونووسی یۆنانی پرۆکۆپیەس وتوویەتی کە تاعوون تەنها لە یەک ڕۆژدا لە ساڵی ٥٤٢ دە هەزار ژیانی لەناوبرد.

"تەواوی ڕەگەزی مرۆیی نزیکبووەوە لە لەناوچوون" ئیڤاگریەس، کە چاودێرێکی دیکەی سەردەمەکەیە تێڕوانینی

وابـووه كه تـاعوون سـێ سـەد هەزار ژیـانی له پـایتەختی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی لەناوبردووه.

ئەم ژمـارانە ژمـارەی سەراسـیمابوونن، سەراسـیمابوون به هۆی ئەو وێرانكاریه لەناوبەرەوه.

پرۆكـۆپیەس و چاودێرەكـانی دیـكەی یۆنـان ئاشـنابوون لەگەڵ بڵاوەپەتاكانی دیكه، بەڵام هەموویان هـاوبۆچوونن كه هیچ یەك له پەتاكانی پێشوو هاوشێوەی تاعوونی جوستیان نەبوون.

نووسـەره عەرەبەكـانی پـێش ئیسـلام تێبینـی نـوێی بارودۆخەكەیان كردبوو و هەروەها ئەوەیان باسـكردبوو كه تاعوون كاریگەریەكی گەورەی لەسـەر ئامـاری دانیشـتووانی ناوچەكانی ڕۆژهەڵاتی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی هەبووه.

نووسـەرەكانی سـەرەتاكانی ئیسـلام گێڕاویـانەتەوه كه ڕێـژەی مـردن به شـێوەیەك بـووه كه بـووەته هـۆی دەستهەڵگرتن له ڕێورەسمەكانی مردوو ناشتن.

كاتێك له كۆتایدا گەشته ناوچه سەرەكیەكانی بەریتانیا له ناوەڕاستی سـەدەی حەڤدە، قەشـه بێد له تۆمـاری مێژووی كەنیسـەی خۆیـدا، بەداخەوه دەڵێـت، تـاعوون "پەتـایەكی لەناكـاوبووه كه پەلهاویشـتنێكی فراوانـی هەبـووه و وێرانكـاریەكی گەورەی له سەرانسـەری بەریتانیـادا لێكەوتووەتەوه".

بـۆ زیـاتر له دوو سـەد سـاڵ، دەسـتپێك به تـاعوونی جوستیان زیـاتر له دوازده بڵاوەپەتـا داویـەتی له بەشـەكانی ئەورووپا و ڕووژهەڵاتی ناوەڕاست.

لە نزیک کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە پەتاکە کۆتایی هات، لەوانەیە بە هۆی ئەوەوە بوو بێت کە ئیتر بەکتریاکە توانای دۆزینەوەی خانەخوێی گونجاوی نەمابێت لە مرۆڤ و جرجەکانیشدا.

کاریگەریەکانی تاعوون لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە جیاوازە.

لە ڕوانگەیەکی فراوانەوە، کاریگەرەکانی چۆڵکردنی ناوچە لادێییەکان لەسەر داهاتی ئیمپراتۆریەتی بێزەنتی، کاریگەریەکان کۆکراونەتەوە بە لە بەرچاوگرتنێکی وردی دراوناسی، نووسراوەکان و بەڵگە یاساییەکان_ئاماژە بە ئەوە دەکەن کە یەکەم پانەپەتای تاعوون لەوانەیە بەژداری هەبووبێت لە ڕوخانی خودی ئیمپراتۆریەکەدا.

بە پێچەوانەوە پەتاکە نەگەشتە بەریتانیا، تاکو ساڵی ٦٦٤: پاش بیست و سێ ساڵ دواتر نەما.

کاریگەریە ڕاستەوخۆکان_مردنێکی زۆر، جۆڵکردنی پەرستگاکان، چوڵکردنی گوندەکان_بە شێوەیەکی ترسێنەر.

کاریگەریە درێژخایەنەکان بێ بەهابوون، ژیانی ڕەبەنی لە نۆرسەمبریا لە تاعوونی ساڵانی دەیەی ٦٦٠ زیانی توندی بەرکەوت، تەنها پاش دوو نەوە دووبارە ناوچەکە گەشایەوە. وا دیارە تاعوون بەربەرەکانی زەوی بەپیت، دەسەڵاتی شاهانە و سامانی گەورەی پێ ناکرێت.

ئەم دەرئەنجامانە دانراون لەسەر بنەمای بەڵگەگەلێکی تەڵەزم و پارچەبوو، بۆیە کاتێک کەسێک دەیەوێت لە دوورەوە لە ژیانی کڵێساکان و ژیان بەگشتی بڕوانێت کاریگەری بەڵگەکان نامێنن.

کاریگەریە کورت و درێژخایەنەکانی تاعوون لە سوریا بە بایەخەوە تەماشادەکرێت. کەشتی تاعووناوی لە میسرەوە گەشت بە سوریا لە ساڵی ٥٤٢ بە بەندەرەکانی غەززە، عەسقەلان و ئەنتاکیەدا، کە هەر لە ئێرەشەوە گەشت بە دیمەشق و بە باشووردا بڵاوبووەوە. لە قەشە جۆن ئیفسەسەوە زانیومانە کە بڵاوبوونەوەکە وێرانکەربووە. لە ئێرەشەوە تاعوون هەموو حەوت ساڵ جارێک یان نزیک لە ئەوە لە سوریای داوە لە نێوان ساڵانی ٥٤١ و ٧٤٩. لە کورت مەودادا بەرزبوونەوەی ڕێژەی مردن و کۆچی بە کۆمەڵ زۆر شوێنی بە چۆڵی هێشتەوە. لە درێژ مەودادا، دووبارەبوونەی بڵاوبوونەوەکانی تاعوون کاریگەری زیانبەخشی لەسەر بەرهەمی کشتوکاڵی و دانیشتوانی ناوچە ئاوەدانەکان هەبووە.

ژیانی کۆچەری نیمچە دورگەی عەرەبی ڕێگربوو لە بڵاوبوونەوەی تاعوون، ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی هێزی دەشتەکیەکان.

بەردەوامی لاوازی بەرهەمی کشتوکاڵی، واتە کەمکردنەوەی باج لەسەر دانەوێڵە و ڕابوونی ئابووری شوانکارەیی.

ئەو هەموو دوبارەبوونەوەیەی تاعوون لە سوریا و بوونی کاریگەری وێرانکەر لە سەرەتاکانی چاخی ئیسلامی، ناوبانگی ناوچەی تەنراو بە تاعوونی بەخشی بە سووریا. بە هاتنی سەدەکانی ناوەڕاست سوریای ئیسلامی ناسراوبوو بە هەبوونی ئەزموونی تاڵ و کارەساتبار لەگەڵ تاعوون.

ئەوەی دەربــارەی یەکەمــین پانەپەتــای نــایزانین ئەوە تاریک دەکات کە دەیزانین. ئەمە لەوانەیە بگۆڕێت بەبوونی کەرەســتەی شــیکاری ئــاڵۆز. ورد خوێنـدنەوەی ســەرچاوە نووسـراوەکان تەنهـا تـاکو ئێرە دەمانهێنێت. مێژوونووسـان پێویسـتیان بە سـوودبینینە لە پسـپۆڕیەکانی دیـکەی وەکـو ئاژەڵناسـی، شوێنەوارناسـی و زیندەوەرناسـی گەردی ئەگەر بڕیارە کە مەتەڵی یەکەم پانەپەتا لە جیهان ئاشکرابکرێت.

چاخە بێ تاعوونەکانی ئەوروپا لە ساڵی ١٣٤٧ کۆتایهات، کاتێک تاعوون گەڕایەوە و نیوەی دانیشـوانی کیشـوەرەکەی لەناوبرد. لە کۆتایدا کاتێک شـەپۆلی یەکەم کە پێی دەوترێت پانەپەتــای دووەم دووەرکەوتەوە لە ســاڵی ١٣٥٢، لە پــاش خـۆی کیشـوەرێکی بـۆ هەمیشـە گۆڕاوی جێهێشـت. لە دوای دەرکەوتــنەوەکەی لە ســاڵی ١٣٤٧ تــاعوون بە ڕێکــوپێکی ســەریدەدا لە ئەوروپـــا و جیهـــانی ئیســـلامی. دوایـــین پەرپابوونی لە ئەوروپا لە ساڵی ١٧٧٠ لە ڕووسیابوو.

پانەپەتـای دووەمـی تـاعوون یەک ڕووداو نەبـوو، بەڵکـو زنجیرە بڵاوەپەتایەکبوو کە فرەچەشنبوو لە توندی، پێوانە و مەودا.

زۆرێـک لە زانایـان پێیـان وایە تـاعوون تەنهـا یەک جـار گـوێزراوەتەوە بـۆ ناوەنـدی ئاسـیا لە ناوەڕاسـتی سـەدەی چواردە

کە دواتر ئاسیا وەکو کۆگای تاعوونی لێهات.

لێکۆڵینەوەکـانی ئەم دواییـانە دەربـارەی پەیوەنـدی نێـوان گۆڕانی کەشـوهەوا لە ناوەڕاسـتی ئاسـیا و بڵاوەپەتاکـان لە ئەوروپـــا، ئەوە پێشـــنیار دەکەن کە بیـــردۆزە کۆنەکـــان

پێویستیان بە پێداچوونەوە هەیە. ڕێی تێدەچێت تاعوون جار لە دوای جار هاتبێتە نێو ئەوروپاوە. کاتێک کەشوهەوا گەرمبووە، ئاژەڵە قرتێنەرەکانی ناوەڕاستی ئاسیا ژمارەیان تەقیوەتەوە و ڕاگوزەریان زیادیکردووە، بە ئەمەش خانەخوێی زۆر هەبووە بۆ بلاوبوونەوەی کێچ. کاتێک کێچەکان پەڕیون بۆ مرۆڤ و ئاژەڵە ماڵیەکان، کە دواتر گوێزراونەتەوە بۆ ئەوروپا لە سەردەمی بازرگانی بەهێزی نێوان ئاسیا و بەندەرەکانی ئەوروپا وەکو بەندەری دوبرۆڤینک.

بە تێپەڕبوونی سەدەکان، ئەوروپیەکان لەگەڵ تاعوون ڕاهاتن، تەنانەت پێشبینی دەرکەوتنیان دەکرد، هەروەها ڕێگاکانی ڕووبەڕووبوونەوەیان پەرەپێدا. لە ئەنجامدا بۆ نموونە کاردانەوەکان بەرامبەر لێکەوتەکانی تاعوون لە فلۆرێنسا لە ١٣٤٨ جیاوازبوو لە تاعوون لە لەندەن لە ساڵی ١٦٦٥-١٦٦٦. تاعوون بۆ فلۆرێنسا ڕووداوێکی نوێبوو، بەڵام بۆ لەندەن لە ساڵانی دەیەی ١٦٦٠ تاعوون چەندە کارەساتباربوو، لەگەڵ ئەوەشدا بە ڕووداوەکە ئاشنابوون و باش تێگەشتنی زۆریان بۆ نەخۆشیەکە هەبوو، کە هیچ لە ئەمانە بوونیان نەبوو لە ماوەی پانەپەتای یەکەمدا، چونکە نە کەس خۆی بۆ ئامادەکردبوو، نە کەس دەیزانی کە چی ڕوودەدات. پەتایەک کە نوێبوو و بێ هاوشێوە و لە ناوبەربوو. کە ناونرابوو نەخۆشی *مەرگی ڕەش*.

بۆ ماوەی حەوت ساڵ تاعوون هەموو ئەوروپای تەنی و شار و لادێکانی وێرانکرد. تاعوون بۆ یەکەمین جار لە مێژووی تۆمارکراودا لە ساڵی ١٣٤٦ لە بەندەری کافا

لەسەر دەریای ڕەش دەرکەوت و بە سەختی بە هەموو ئەورووپادا بڵاوبووەوە. پێویستە روونبکرێتەوە بۆچی و چۆن ئەو هەموو خەڵکە دەمردن؟ چۆنیەتیەکەی بە چەندین ریگەی پێکداچوو ڕونکراوەتەوە: ویستی یەزدانی، هەڵاوی بۆگەن، درم، شیاوبوونی کەسی بۆ توشبوون.

هەمان شت بۆ کۆلێراش دروستە، ئەم لێکدانەوانە_بە تایبەت هەڵاوی بۆگەن و درم_زاڵبوون بەسەر بیردۆزی نەخۆشی گواستنەوە و تاکو نزیک کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدە وا خوێنراوەتەوە. لە ماوەی مەرگی ڕەشدا_کاتێک کە دووبارە دۆزینەوەی نووسینەکانی گالن و هیپۆکرات، لە ڕێگەی وەرگێڕدراوە عەرەبیە نوێیەکان بۆ دەقە ڕۆمانی و یۆنانییەکان، لە ترۆپکدابوو، هەروەها بیرۆکەی هەڵاوی بۆگەن هۆکار بۆ نەخۆشییەکان شکۆڤەی کردبوو. هەڵاوی بۆگەن و درم لەوانەیە بە ئەو شێوە دژ بەیەک نەبن کە هەبوون. خەڵکی لەوانەیە توشببن بەهۆی هەڵاوی بۆگەنەوە کە لە خاکەوە دزەدەکات، کاتێک ڕووەکە ڕزاوەکان گازە ژەهراوییەکان دەردەدەن. دواتر خەڵکەکە توشدەبن و توانای گواستنەوەی نەخۆشییەکەیان بۆ یەکدی دەبێت_بە تایبەت ئەو کەسانەی کە شیاوی توشبوونیان زیاترە، وەکو تاوانباران، سەرکەش، بێ ئابڕو و چاوچنۆک و هەژارەکان.

ئەم لێکدانەوە بەرجەستەییانە بۆ ڕێڕەوی تاعوون بە هاوپێچی لەگەڵ ئەوەی پێی دەوترێت هۆکاری بنچینەیی تاعوون: تورەیی یەزدان.

ڕاڵف لە شرێوسبەری، سەرۆک قەشەی کەنیسەی باس و وێلز پێش گەشتنی تاعوون پێی، فەرمانی بە ڕەوەکەی

خۆی کرد بپارێنەوە، لە پیریدا و لە کۆتایی هاوینی ساڵی ١٣٤٨ نووسیبووی "لە ئەو کاتەی کارەساتی درمەکە لە ڕۆژهەڵاتەوە گەشتۆتە شانشینە دراوسێکان، زۆر جێگەی ترسە ئەگەر بە دڵسۆزی و بەردەوام نەپارێینەوە، پەتایەکی هاوشێوە پەڵە ژەهراویەکانی دەکشێنێت بۆ شانشینەکە و دانیشتوانەکەی قڕدەکات." لێکدانەوە ئاسمانیەکان لە لایەن کەسانی دیکەوە پاڵپشتیکران. لە یەکێک لە وردەکارترین شرۆڤەکاریەکانی هاوسەردەمی پەتاکە، مامۆستایانی بەشی پزیشکی لە پاریس لە ساڵ ١٣٤٨ نووسیبوویان "هۆی یەکەم و کۆتای ئەم درمە لە ئاسمان ڕێکخراوە و ڕێکدەخرێت.... ئەم درمە لەگەڵ ڕوداوەکانی پێشوو و گیرانی خۆر، کە هۆکاربوون بۆ تێکچوونێکی خراپ لە هەوای دەوروبەرمان، قاتیو قڕبوونیان لێکەوتووەتەوە." بە تایبەت کاتێک هەسارەی مەریخ و موشتەری هاوەڵی دروستدەکەن، دەبنە هۆی دروستبوونی "درمێکی گەورە لە هەوادا." هەسارەی موشتەری هەڵمی نێو خاک ڕادەکێشێت و هەسارەی مەریخ گڕی تێبەردەدات. بەڵام سەرەڕای ئەم ڕوونکردنەوە زانستیە، کەسێک کە تێڕامان و بیردۆزە پاڵنەرییێت و باوەڕی بە بیرۆکەی جڵەوکردنی نەخۆشیەکان بێت لە ڕێگەی پزیشکیەوە، هێشتا بۆ ئەو هۆکاری بنچینەیی تاعوون یەزدانیە. "پێویستە ئەو ڕاستییە بە کەم سەیرنەکرێت کە هەر درمێک ویستی یەزدانە، بۆیە ئامۆژگاری ئێمە تەنها بریتییە لە گەڕانەوەیەکی ملکەچانە بۆ لای یەزدان."

زۆرێک تۆقین کاردانەوەیانبوو بەرامبەر تاعوون، وەکو چۆڤانی بۆکاچیۆ کە بە ڕوونی لە پەرتووکی

دیکـــامیرۆن ( The Decamerone) تۆمـــاری کـــردووه.
پەرتـووکی دیکـامیرۆن بەرهەمێکـی وێژەیـی بـێ هاوتـایە لە نماینـدەکردنی هـاتنی تـاعوون. بۆکـاچیۆ بـێ بـاوەڕبوو بە هۆکاری تاعوون_لەوانەیە "کاریگەری تەنێکی ئاسمانی بێت، یان لەوانەیە "سـزایەک بێـت، زلەیەکـی میهرەبانـانەی یەزدان بێـت بە هـۆی ژیـانی سـتەمکارانەمانەوە." هۆکـارەکەی هەر چییەک بێـت، "لە بەرامـبەر هێرشـەکانی تـاعوون، هەر چـی ژیـری و بلیمەتـــی مـــرۆڤ هەیە بێســـوودە. ...ســـەرجەم ئامۆژگـــاری پزیشـــکەکان و هێـــزی پزیشـــکی بێئەنجـــام و بێسوودن."
ئەو بەدبەختیەی تاعوون لەگەڵ خۆیدا هێنای، خەڵکی برد بەرەو فەرامۆشکردنی یاساکانی خـودا و مرۆڤـایەتی؛ کەسـی زیندوو کەمبوو کە ناچاریان بکات.
خەڵکـانی دەرەوەی شـــار و بـــێ چـــاودێری پزیشـــکی و خێزان و کۆمەڵگە بۆ گرنگی پێدانیان، بۆکاچیۆ نووسـیبووی، دەمردن "وەکو ئاژەڵ نەک مرۆڤ."
پێشـتر هەرگیـز کارەسـاتی هاوشـێوە ڕووی نەداوە. "چـا دڵی یەزدانە (یـان بە هەندێک پێوەر، دڵـی مـرۆڤە) کە بە ئەو ئاستە ڕەق و وێرانەخوازە کە بە تەنها لە نێوان مـانگی ئادار و تەمـووزی ئەو سـاڵە....بە دڵنیـاییەوە بـاس لە لەنـاوچوونی ژیانی زیاد لە سەدان هەزار کەس لە نێو دیوارەکـانی شـاری فلۆرێنسا دەکرێت."
چـــاودێرێکی فەرەنســـی تێبینـــی کردبـــوو کە نیـــوەی دانشـیتوانی شـاری ئەڤینـۆن لەنـاوچوون؛ لە شـاری مرسـیلیا چوار کەس لە هەر پێنج کەسێک مردن.

کاتێک کە نەخۆشییەکە بە فەرەنسادا تێپەڕبوو، "ڕێژەی مردن (ترس لە مەرگ) بە جۆرێکبوو پیاو بوێری قسەکردنی نەبوو لەگەڵ هەر کەسێک کە ژن یان پیاوێکی خزمی بەهۆی تاعوونەوە مردبێت، چونکە تێبینی ئەوەیان دابوو کاتێک تاکێکی خێزانێک بە هۆی تاعوونەوە دەمرێت، هەمیشە سەرجەم خێزانەکەشی بە دوایدا دەمردن."

ترس و گومان ئەوەندە بالآبوون؛ تاکەکانی خێزانێک مامەڵەیان لەگەڵ نەخۆشەکانیان وەکو سەگ دەکرد؛ دراوسێکان خۆیان لە یەکتر دووردەگرت. شار لە دوای شار مردووەکانیان بە کۆمەڵ لە چاڵەکانی تاعووندا دەناشت کە ئەمەش هەڵگەڕانەوەبوو لە ڕێوڕەسمی باوی ناشتنی مردوو، خۆ ئەگەر بۆ ماوەیەکی کورتیش بێت، شکاندنی یاساکان پەیڕەودەکران.

بێچارە لە بەرامبەر لەناوچوونێکی لە ئەو شێوەیەدا، زۆر کەس هەڵهاتنیان هەڵبژارد، بەڵام لە جیهانی ئیسلامیدا هەڵهاتن لە فەرمانی خودا بە کوفر دادەنرا.

هەندێک قوربانیکردنیان هەڵبژارد، خەڵکانی ڕەشۆکی نزیک بە دە هەزار کەسیان لە جڤاتی جولەکە لە سەرانسەری ئەوروپادا لەناوبرد.

سەرەڕای ئەو بێچارەیەی کە زۆرێک بەسەریاندا هاتبوو، شارەکانی هاوشێوەی ڤێنیسیا و فلۆرێنسا بەرسڤیان دایەوە بە دروستکردنی لیژنەی تەندروستی. بۆ دڵنیابوونەوە لە پاکێتی هەوا، فەرمانیان کرد بە پاککردنەوەی زێرابەکان و کۆکردنەوەی خاشاک. کاتێک کە بە تەواوەتی دەرکەوت تاعوون لە ڕێگەدایە بەرەو فلۆرێنسا، شارەکە ڕێگەی نەدا

گەشتیارانی شارەکانی جینوا و بیزا بێن بۆ نێو فلۆرێنسا. کاتێک تاعوون گەشت، ڕێنماییە تەندروستییەکان لە هەوڵداندابوون بۆ لابردنی "هەموو ماددە بۆگەن و کەسە توشبووەکان کە هۆکارن بۆ تێکچوونی هەوا."

ئەم ڕێکارانە زۆر بێ سوودبوون. تاعوون هات و خەڵکی کوشت.

ئەوە سەدەیەک یان زیاتری خایاند، تاکو ڕێکاری کاریگەر شوێنی خۆی بگرێت، بە هەر حاڵ تاکو ئەو کاتەش توندی تاعوون خۆی کەمیکرد.

ئەو کەسانەی لە ماوەی مەرگی ڕەشدا ژیان، بە چەندین ڕێگە کاردانەوەیان هەبوو: دەیانویست لێکدانەوە بۆ کارەساتەکە بکەن؛ ترس لێیان ئالاّبوو؛ هەڵدەهاتن؛ بیانییەکانیان تاوانباردەکرد.

ئای چەند گرانە جیاکردنەوە کاریگەریە درێژخایەنەکانی تاعوون لەسەر ئاماری دانیشتوان، ئابووری، نەریتی کۆمەلاّیەتی، کلتوور، ئاین، و زۆری دیکەش. لە کاریگەریی کورتخایەندا، تاعوون بەشێکی زۆری دانیشتوانی لەناوبرد_یەکێک لە ئەم دوایییانەدا بە لەناوبردنی ٦٠٪ ئەوروپا خەملاّندنی بۆ کردووە. دانیشووانی ئەوروپا هەر ئاوا بە کەمی مایەوە بۆ ماوەی سەدەیەک، کە بووە هۆی کەمبوونەوەی هێزی کار، داواکاری بۆ موچەی زیاتر و هەڵئاوسانی بازاڕ، و چۆڵبوونی خاکی زیاتر. ئاشبەتاڵی دانیشتوان، بۆ ماوەیەکی درێژخایەن گۆڕانکاری لە چەند لایەنێکی ژیانی کۆمەلاّیەتی و ئابووریدا کرد، باشترین تۆمارکردن بۆ ئەم گۆڕانکارییانە لە ئینگلستان بوو. لە ساڵی

١٣٩٤، (دەگمەنـــی کرێکـــار) ســـەرۆکی پەرســـتگا و ئاغـــای ناوچەی ئینشـام ئـابی ناچارکرد کە ڕێکەوتننامەیەکی نـوێ لەگەڵ کرێگرتەکانیـان بە مەرجـی خـوازراوی کرێگرتەکـان ئەنجامبدەن. لە سـاڵی ١٣٥١ جوتیارەکانی مـوڵکی جۆن دی ڤێر و ئاغـای ئۆکسـفۆرد لە زۆرێک لە کۆت و بەنـدەکانیان ئـازادکران. لە یەکێکـی دیـکە لە موڵکیەتەکـان لە کۆشـکی دراکیلـۆ لە چیشـیریا، کـرێ بـۆ سـێ ئەوەنـدەی "شایسـتە" کەمکـرایەوە بە پێـی ئەفســەری ژمێریـار جـۆن وودهـۆل "بە هـۆی کاریگەرییەکـانی پەتـاوە، کرێگرتەکـان هەڕەشـــەی جێهێشتنی کارەکانیان دەکرد (کە دەبووە هـۆی چۆڵکردنی نیشـــنگەی میرەکـــان) مەگەر لە کـــۆت و بەنـــدەکانیان خۆشبوونایە، دەبێت ئەم بارەش بەردەوام بێت، تـاکو جیهـان بەرەو باشـــتربوون بچێـــت و نیشـــینگەکان بەهایـــان بەرزببێتەوە."

مـوچە زیـادیکرد، بەڵام نرخـی سـەرجەم پێداویسـتیە سـەرەتایەکانی ژیـانیش زیادیکرد_زیـادبوونی داخـوازی لەسـەر هێـزی کـار بەهـۆی دەگمەنـیەوە، واتـا دەگمەنـی شتمەکی لێکەوتووەتەوە.

لە وەڵامی داواکاری بۆ کرێی کەمتر و موچەی زیاتر، پەرلەمـان لە سـاڵی ١٣٤٩ فەرمـان لەسـەر کارێکـاران و لە ساڵی ١٣٥١ یاسای کرێکارانی تێپەڕکرد بۆ سنووردارکردنی کرێ: هەروەها ناچارکردنی خەڵکی بۆ کـارکردن و سزادانی لادەران و سەرپێچیکەران.

بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی کورتهێنان لە هێزی کار حکومەت دەستبەجێ کەوتە گەڕ بۆ دژایەتی کردنی ئەوانەی کە قەیرانەکان دەقۆزنەوە.

بوونی یاسا لە دژی داواکاری بۆ کرێی کەمتر و موچەی زیاتر، بە دڵنیاییەوە ئاماژە دەکات بە ئەوەی کە ڕاستەوخۆ پاش مەرگی ڕەش و چەند دەیەیەکی دواتری سەدەی چواردە گۆڕانێکی بەرچاو لە هۆش و ڕوانینی خەڵکیدا هەبووە، هەروەها توانجی گەورە پیاوان لەسەر هەڵسوکەوتی (زۆر ناشیرینی) جوتیاران سەلمێنەرە.

جوتیاران پارەی زیادە دەستکەوتوویان بەکاردەهێنا بۆ دەستکەوتنی بەرگ و پۆشاکێک کە شایستە نیە بۆ پێگەی ئەوان لە ژیانـدا؛ هەروەها زیاتر خۆیان بە ڕاوکردنەوە سەرقاڵ دەکرد_کە ڕۆژانێک تەنها خولیای دەوڵەمەندان بوو.

جۆن گۆوێری هۆزانڤان پەژارەی خۆی دەردەبڕێت بۆ لەناوچوونی شێوازی کۆن "جوتیارانی سەردەمی کۆن ڕانەهاتبوون بە خواردنی نانی گەنم؛ بەڵکو نانیان لە پاقلە و دانەوێڵەکانی دیکە دروستکرابوو، خواردنەوەیان تەنها ئاو بوو، شیر و پەنیر جەژنە خوانیان بوو؛ بە دەگمەن خوانی دیکەیان هەبوو. پۆشاکیان سەرتاپا ڕەساسی بوو. هەروەها جیهانی ئەو خەڵکانە باش فەرمانداری کرابوون_زەویەکانیان." بەڵام ئێستا "کاتە خۆشەکانی سەردەمی کۆنمان درندانە کۆتایی هاتووە"، چونکە "خزمەتکارەکان ئێستا سەرۆکن و سەرۆکەکانیش

خزمەتكار.... جوتیارەكان لاسایی ئازادەكان دەكەنەوە و لە پۆشاكدا دیمەنی ئەوان بە خۆیان دەبەخشن."

هەروەها دەركردنی یاسای *سزادانی ڕەوشتی* بۆ "چەندین كەس كە زیادەڕەویان لە پۆشاككردن دەكرد كە پێچەوانەی پێگە و ئاستیان بوو." دووبارە ئاماژەیە بۆ ئەوەی كە هەڵسوكەوتی جوتیاران لە ئەو كاتانەدا زۆر گۆڕابوو.

داخ و شیوەن بۆ ڕابردوو، بۆ ئەو كاتانەی كە خەڵكی سنووری خۆیان دەزانی لە دەیەكانی پاش مەرگی ڕەش باوبوو.

سەرەڕای بوونی یاسا بۆ قەدغەكردنی هەردوو داواكاری یان پێدانی موچەی زیادە، بەڵام دیاردەكە هەر باوبوو: خراپتریش كرا پاش بڵاوەپەتا یەك لە دواییەكەكان لە ساڵی ١٣٦٠-١٣٦٢ و ساڵی ١٣٦٩، زۆر جاریش جگە لە قایلبوون هیچ چارەیەكی دیكە نەبوو.

لە ئیتاڵیا هەر ئاوا كرێكاران داوای موچەی زیاتریان دەكرد، لە فلۆرێنسا كرۆنێلەر ماتیۆ ڤیلانی نووسیبووی "كچانی خزمەتكار و ژنانی بێ بەهرە لەگەڵ نەبوونی هیچ ئەزموونێكی خزمەتكاری و كوڕانی پێگەشتوو بە لایەنی كەمەوە ساڵانە ١٢ فلۆرێنیان دەویست، كەسە بەفیزەكانیان داوای ١٨ یان ٢٤ فلۆرێنیان دەكرد لە ساڵێكدا، هەروەها پەرستار و پیشەوەرە دەستیە لاوەكان موچەیان نزیكەی سێ ئەوەندەی موچەی ئاساییانبوو، كرێكاران لە زەویە كشتوكاڵیەكان هەموویان داوای گا و سەرجەم تۆوەكانیان

دەکرد، هەروەها داوایان دەکرد بۆ کارکردن لە باشترین زەوییەکان و فەرامۆشکردنی زەویەکانی دیکە.*

ئەو هەموو داواکاریە و چەند کاردانەوەیەکی کەمی نیگەرانبوون تێڕوانینی ئەوەت دەداتێت کە کاردانەوەی فەرمی بریتیبووە لە: هەوڵدان بۆ ڕاگرتنی بەرزبوونەوە مووچە و ناچارکردنی خەڵکی بۆ ڕازیبوون بە کارکردن جا هەر مەرجێکیان هەبێت.

جا بە هۆی ئەوەی کە پەیبردنی ورد بە ئەوەی کە پێوەرەکانی ژیان لەوانەیە چۆن گۆڕابێتن_چۆن بیڵێم، واتە قورسە یان ئەستەمە_بەس وا دەردەکەوێت هەریەک لە پیاوان و ژنان لە دەیەکانی پاش مەرگی ڕەش، لە گاڵتەجاری چارەنووسدا، ژیانیان باشتربوویێت لە هاوئاستەکانیان لە دەیەکانی پێش تاعووندا.

تیاچوونی دانیشتووانی ئەورووپا کۆست و شۆکێکی کاتی بوو. لە ماوەی سەدەیەکدا بەرهەمداری کیشوەرەکە و دانیشتوانەکەی گەڕێندرانەوە، تەنانەت نەشونماشیانکرد، بەڵام نزیکەی دوو سەد ساڵ زیاتری خایەند بۆ بەدەستهێنانەوەی هەمان ژمارەی دانیشتوانی پێش تاعوون لە بەشێکی گەورەی ڕۆژئاوای دەریای سپی ناوەڕاستدا؛ بەڵام لە ئینگلستان تاکو ساڵی ١٦٠٠ خایەند.

لەگەڵ ئەمانەشدا کەمبوونەوەی دانیشتوان کاریگەری خراپی بە دوای خۆیدا نەهێنا. یەکێک لە ڕوونکردنەوە شیاوەکان ئەوەیە کە دانیشتوانی پێش پانەپەتا گەشتبووە قەبارەی شلۆقی *مالسۆس*، کە قەبارەیەکە تێیدا سەرچاوەکان دەگەنە ئەوپەڕی توانستی بەرگەگرتنیان. لە

ئەم ڕوانگەیەوە، مەرگی ڕەش کە ناسۆرێکی کورتخایەنبوو، لەوانەیە مایەی سوودبووبێت ئەگەر لە ئاسۆیەکی دوورەوە لێی بڕوانرێت.

زیادبوونی مووچەی ڕاستەقینە لە سەرانسەری ئەوروپادا لە پاش سەدەیەک لە تاعوون کە بە باشی تۆمارکراوە، لەوانەیە باشترین لێکدانەوە بۆی زیادبوونی بیمەی کاربێت نەک تاعوون.

گۆڕانکاری لە ئاماری دانیشتوان و ئابووری لە ڕووبەرێکی وەها بەرفراوان ئەستەمە بتوانرێت بدرێتەپاڵ یەک هۆکار، هەر چەند هۆکارەکە لەناوبەریش بێت. تەنانەت گشتاندنیش ئاسان نییە بۆ یەک هۆکار.

چەندین گۆڕانکاری پێشتر لە ڕوودانداببوون: دانیشتوان لە ئێرەو لە ئەوێ کەمی دەکرد؛ لە زۆر شوێن پێش مەرگی ڕەش پەیوەندی نێوان کرێکار و خاوەنکار لە گۆڕاندابوو_دەرەبەگایەتی لە زۆر شوێنی فلۆرێنسا و هۆڵەندا کۆتایی هات لە سەدەی دوازدە و سێزدە بەبێ هیچ هاوکاریەکی تاعوون. بەڵام لە لایەکی دیکەوە، دەکرێت مەرگی ڕەش هەنگاو پەیداکەربێت بۆ سەدەیەک یان زیاتر لە داهێنانی تەکنەلۆژی. ئامێرەکانی بەرهەمهێنانی وزە وەکو ئاشی باو ئاشی ئاو و چەکی ئاگرین زیادیکرد.

ئایا ئەم ئامێرانە بەرسڤێک بوون بۆ کەمی هێزی جەستە لە کاتی تاعووندا؟ دەکرێت.

وا دیارە نکۆڵی ناکرێت لە ئەوەی کە ئەگەر تاعوون تاکە هۆکاری گۆڕانکاریەکان نەبووبێت، بە دڵنیاییەوە تاودەریان بووە.

کارەساتێک بە ئەو ئاستە بێگومان نیشانە دادەنێت لەسەر نووسین، هونەر و ئاین.

لە سەردەمی تاعووندا ئاینخوازیەکی زۆر دەبینین لە هەندێک شوێن، یاخیگەری دژ بە کۆتو بەندیەکانی کەنیسە لە هەندێک شوێنی دیکە. شەللاق لە خۆدەرەکانی ناوەڕاستی ئەوروپا، ئەو ئایندارانەی کە لە بەرچاوی خەڵکی شێوازی تایبەتی ڕێوڕەسمی ئاینی ئەنجامدەدەن، بە شەللاق لە خۆیان دەدەن، جگە لە کارەکانی دیکەیان_دەستیانکرد بە لاسایکردنەوەی کاری باوی پیاوە ئاینیەکان و بانگەشەکردن بۆ ئەوەی کە مەسیح لە ڕێگەدایە بەرەو زەوی بۆ کۆتایهێنان بە جەور و ستەم، بە وەرگرتن لە دەوڵەمەند و پێدان بە هەژار.

تێکەڵبوونی جوانیەکان بە سامناکی مەرگ لە هونەردا، ئاماژەیە بۆ ئاگاییەکی نوێ دەربارەی مەرگەساتی چاوەڕواننەکراو.

ژمارەی زانکۆکان پاش تاعوون زیادی کرد_کەمبوونەوەی کڵێساکان و تێکچوونی پارەوەی خوێندن هاندەری بونیادنانیانبوو. لە ئینگلستان کڵێسە کاتیدراڵیە گەورەکان بواریان کردەوە بۆ بونیادنانی کڵێسەی بچووک و سادەتر.

لە دەیەکان و سەدەکانی پاش مەرگی ڕەش پزیشکەکان متمانەی زیاتریان بەدەستهێنا، ڕێژەی مردن کەمی کرد، حکومەتەکان ئەرکی کاریگەرتریان لە چڵەوکردنی تاعوون وەرگرت. خەڵکی بە بوونی تاعوون ڕاهاتن و لە زۆر شوێن بوو بە دیاردەیەکی ئاسایی ژیان.

لەنـدەن لە نێـوان سـالانی ١٥٠٠ و ١٦٦٥حەڤـدە جـار بەرپابوونی تاعوونی چەشت. بۆ نزیکەی سێ سەد ساڵ لە نێوان ١٥٠٠ و ١٧٢٠ فەڕەنسا هیچ ساڵێکی بە بێ تاعوون تێنەپەڕانـدووە. لە میسـرِ تـاعوون هەمـوو هەشـت بـۆ نـۆ سـالێک دەردەکەوتەوە، لە سوریا_فەڵەسـتین هەژدە بڵاوەپەتـای سـەرەکی هەبـوون لە نێـوان مەرگـی ڕەش و هاتنی عوسمانیەکان.

ڕێکوپێکی لە بەرپابوون و هەروەها بوونی ئەو ڕاستیەی کە تـاعوون هەرگیـز وەکـو جـاران لەنـاوبەر و شـۆکهێنەر نیە_وەکو مەرگی ڕەش واتای بوونی ترس و تاوانبارکردنی کەمتـر؛ بە پـێچەوانەی هێرشـە بـێ شـومارەکان بـۆ سـەر جولەکەکـان، لە مـاوەی سـەدەی دواتـردا تەنهـا یەک هێرش هەبووە، کە لە پۆڵەندابوو.

تـاعوون ئەو تـرس و شـۆکەی جـارانی بـۆ نەگەڕایەوە؛ تاعوون بە شێوەیەکی سەیر ئاسایی بوو.

پزیشـکەکان و هەروەهـا شـارەوانیەکان متمانەیـان پەیداکرد لە توانستیان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی نەخۆشیەکە.

لە کاتێکـدا کەس نەیـدەزانی کە کەی و لە کـوێ تـاعوون دێت_تاعوون وەک یەکێک لە مێژوونووسان دەڵێت، خـاوەنی 'هەڕەمەکیەکـی دژوار'بـووە_وردە وردە شـێوازێکی فـراوان خـۆی ئاشـکرا دەکـرد: یەکەم جـار، تـاعوون لە بەنـدەرەکانی داوە؛ دواتر بۆ ناوەوەی شارەکان، دواتر لە شـارەکانەوە بۆ هەموو وڵاتەکە.

لە شـارەکاندا لە هەنـدێک گەڕەکـدا دەرکەوتـووە و لە هەنـدێکی تـردا دەرنەکەوتـووە؛ هەروەهـا لە مـاڵێکەوە بـۆ

مـــاڵێکی دیـــکە، بەدڵنیـــاییەوە بەشـــێوەیەکی هەڕەمەکـــی دەگوێزرایەوە.

ورده ورده شـــێوازەکانی ڕەفتـــار بەرامـــبەر تـــاعوون دەردەکەوتن. وەکو هەڵهاتن کە باوبوو. چونکە پێویستیەکی ناچـاری هەبـوو بـۆ خۆپاراسـتن کە لە هەمـان کاتـدا، واتە فەرامۆشکردنی ئەوانی دیکە.

بە شـــێوەیەکی گشـــتی، حکومەتەکـان ســـەلامەتبوون، و تاعوون واتای کۆتایی یاسا کۆمەڵایەتیەکان نەبوو.

کاردانەوەی ڕەسمی بۆ تاعوون_لیژنەکانی تەندروستی پاڵپشتیکراو لە لایەن حکومەتەوە، نەخۆشخانەکان، خانەکانی پەتـا و کەرەسـتەکانی دابڕانـدن_بووە هـۆی بەهێزبـوونی حکومەتەکان لە ٘سەرانسەری ئەوروپای هاوچەرخ.

هەر چەنـــدە ڕێگاکـــانی جڵەوکـــردن دەگـــۆڕان، بەڵام پزیشکەکان کەمترو کەمتر لە بنەچەی تـاعوون تێدەگەشـتن کە وا دادەنـرا لە تـوڕەیی یەزدانەوە بێـت یـان لە ڕیزبـوونی هەسارەکان.

دواتر پزیشکەکان دەگەڕان بۆ ئەو لێکدانەوانەی کە زیاتر بەرجەستەن و بەردەوام لە هەوڵدابوون بۆ چارەسـەرکردنی نەخۆشـیەکە. لە کۆتـایی سـەدەی چـوارده، بە شـێوەیەکی زیاتریش لە سەدەی پازده، پزیشکەکان وەها لە تاعوونیان دەڕوانی کە بەسوودە بۆ پیشەکەیان.

سـامانی ئەو ئەزمـوونە کـردەییەی کە لە تـاقیکردنەوەی چارەسەرە جیاوازەکان بەدەستهاتووە بە باشـی تۆمـارکراوە لە ئەو ژانـرە نـوێیەی نووسـین کە لە کۆتایەکـانی سـەدەکانی

ناوەڕاستدا سەریهەڵدا و تەرخانکرابوو بۆ باسکردنی تاعوون: *یاداشتنامەی تاعوون*.

لەبەرئەوەی هەندێک لە بڵاوەپەتاکان بە نزیکەیی بچوکتربوون، خەڵکی بۆ ناسینی نەخۆشییەکە لە بارودۆخێکی کەمتر سامناک و نیگەراندا کاتیان هەبوو، کە لە بڵاوەپەتا گەورەکاندا هەبوون. متمانەی نوێی بەدەستهێنراو لە ناسینی تاعوون وای لە زۆرێک کرد کە بانگەشەی ئەوە بکەن کە ئەمان مامۆستا دێرینەکانی وەکو هیپۆکرات و گالنیان تێپەڕاندووە، هەروەها سووربوون لەسەر ئەوەی زاناکانی پێشوو هیچ ئەزموونیان لەگەڵ ئەم نەخۆشییەدا نەبووە و ئەمان ئێستا خۆیان مامۆستان.

لە دوای مەرگی ڕەش، هیچ مەرگەساتێکی دیکەی هاوشێوە نەبینراوە، کە تێیدا زنجیرە بڵاوەپەتایەک هەبوو_سەرو ٦٠٪ دانیشوانی شاری جینوا لەناوچوون لە ساڵی ١٦٥٦-١٦٥٧، هەروەها بە لایەنی کەمەوە شەش بەرپابوونی دیکە کە سەروو ٣٠٪ دانیشوانی شوێنەکانی وەکو مرسیلیا، پادوا و میلانی لەناوبرد.

بە گشتی ڕێژەی مردن کەمیکرد. ئەو کەمبوونەوە ئاشکرایەی ڕێژەی مردن هاوکاتبوو لەگەڵ پەیدابوونی متمانە نوێیەکە بە پزیشکی. هەندێک لە ئەو متمانە نوێیە بەدڵنیایەوە پەیدابوو بە هۆی تێگەشتنی نوێ لە نەخۆشییەکە وەک پێویستی دابڕاندنی نەخۆشەکان. بەڵام دەکرێت نەخۆشییەکە خۆی کەمترو کەمتر توندبوووبێت، کاتێک دانیشتوان هەندێک بەرگری لەشیان بۆ نەخۆشییەکە پەیداکردبێت.

بیرۆکەی گواستنەوەی نەخۆشی مێژوویەکی دوور و درێژی هەیە، کە بە ڕێگەیەکی خوارو خێچدا لە گالنەوە تێپەڕیوە، کە داهێنەری بیردۆزەی *تۆوی توشبوونە*، بۆ سەردەمی ڕینیسانس؛ بە درێژایی ڕێگاکەی لە جیهانی عەرەبی وەستا، چونکە کەمتر جێی سەرنجبوو بە بەراورد بە هەڵاوی بۆگەن و یەزدان؛ هەروەها لە سەدەی شازدە بە تەواوەتی چەسپا. بیرۆکەی ئەوەی کە تاعوون دەکرێت بڵاوببێتەوە، هەر زوو لە کۆتاییەکانی سەدەی چواردەدا دەرکەوت.

کاتێک تاعوون خەریکی وێرانکردنی ناوچەکانی دەریای سپی ناوەڕاستبوو، نووسەری عەرەب ئیبن خەتیب ئاشکراترین بەیاننامەی پێشکەشکرد کە لە بەرژەوەندی درمدا بوو. تێڕوانینەکانی ئیبن خەتیب لە ئەوپەڕی دژایەتیدابوو لەگەڵ باوترین باوەڕی موسوڵمانەکان کە بریتیبوو لە ئەوەی تاعوون لە لایەن خوداوە نێردراوە.

ئیبن خەتیب نووسیبووی، "ئەگەر پرسیارکرا، چۆن ئێمە قایلی بیردۆزەی درم بووین، لە کاتێکدا پێشتر شوێنکەوتووانی یاسای یەزدانی بیرۆکەکەی بەدرۆخستبووەوە، لە وەڵامدا دەڵێین: بوونی درم سەلماوە بە ئەزموون، هەڵێنجاندن، هەستپێکردن، سەرنجدان و ڕاپۆرتی کۆدەنگی، ئەوانەی باسکران جۆرەکانی بەڵگەن."

بیردۆزەی درم کە دەستیکرد بە دەرکەوتن لە سەرەتای سەردەمی هاوچەرخی ئەورووپا، زۆرجار بیردۆزی هەڵاوی بۆگەن یاوەری دەکرد. هەروەها یەزدان هێشتا ئامادەبوونێکی بەهێزی هەبوو. هەندێک، وەکو بانگخوازی ئینگلیسی ڕیچارد لێک، هیچ چاوپۆشییەکی نەبوو بەرامبەر

ڕوونکردنەوە دنیاییەکان، وتی، "ئەمە نە توشبوونی هەڵاوی بۆگەنە، نە تێکچوونی لەشی مرۆڤ، چ جای کاری خراپ و شەیتانی جادووگەرەکان، هەروەها نە بەختی خراپ، یان هەر هۆکارێکی دیکەی خەیاڵی نیە، کە بانگەشەی نەگریسەکانە، بەڵکو زۆری و گەورەیی تاوانەکانمانە." بۆ ئەو سەردەمە تاعوون سزای خودابوو.

لە گوندی مۆنتۆ لوپۆ، لە ناوچە دوورە دەستەکانی توسکان، تاعوون لە پایزی ساڵی ١٦٣٠ گەشت. بەرپرسە دنیاخواز و ئاینخوازەکان لەگەڵ یەکدی لەسەر هۆکار و چارەسەرەکان جەنگیان کرد. سەرکردە ئاینخوازەکان هاوکات لەگەڵ زۆرێک لە دانیشتوانی ناوچەکە، دەیانویست یەزدان هێوربکەنەوە بە ڕێپێوانی ئاینی. بەڵام بەرپرسە دنیاخوازەکانی تەندروستی، باوەڕیان وابوو کە تاعوون درمە، هەوڵیاندەدا ئەو جۆرە کۆبوونەوانە سنوورداربکەن و نەخۆش و خێزانەکانیان جیابکەنەوە، کە ئەمەش هەڵچوون و توندوتیژی لێکەوتەوە.

لە ئیسپانیا و ئیتاڵیا نووسەرەکانی وەک فرانسیسکۆ ڤالی، فیتیریۆ ترینکاڤێلا، هەروەها گیرۆلامۆ فراکاسترۆ ئەوەیان خستەڕوو کە نەخۆشییەکانی وەکو تاعوون لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە دەگوازرێنەوە. هەر وەکو ڤالی لە لێدوانەکانی لەسەر بیردۆزەکەی گالن لەسەر پەتا دەڵێت، "هیچ درم یان نەخۆشییەک نابێت ڕووبدەن بەبێ گواستنەوەی شتێک لە کەسێکەوە کە پێشتر توشبووە بۆ کەسێک کە توش دەبێت. ئەمەش پەسەندکراوە، لە ئەوەتەی هەموو کردەیەکی سروشتی بە بەرکەوتن ڕوودەدات....بە ئەمەش تۆوەکانی درم دەگوێزرێنەوە، کە جۆرێکە لە

جۆرەکانی پیسبوون، لە کەسی توشبووەوە بۆ ئەو کەسەی خەریکە درم کاری لێدەکات." بەلام تێڕوانینی سەرەتاکانی سەردەمی هاوچەرخ جیاوازبوون لە ئەوانەی سەردەمی هاوچەرخ. ستیڤن برادوێل، توانجدەرێکی ئینگلسیە، لە ساڵی ١٦٣٦ نووسیویەتی، کە درم و هەلاوی بۆگەن تێکەڵدەکران بەبێ هیچ ڕاڕاییەک، چونکە بۆ ئەوان لە ئەم قۆناغەی شەنوکەوکردنی تاعوون (هەروەها نەخۆشییەکانی دیکەش) درم و هەوای بۆگەن دوو لایەنی جیانەبوون: وەکو نووسیبووی، "ئەو کەسەی کەسانی دیکە توشی هەمان شێوەی ئەوەی خۆی دەکات بە دەستلێدان، یان لە ڕێی ناوەندێکی بەرکەوتنەوە وەکو تەنێک یان ڕۆحێک یان هەوایەکی هەڵمژراوەوە دەبێت." هۆکاری توشبوونەکەش بریتیبووە لە "تۆخمێکی ئاینی لە جۆری تەواو ژەهراوی، کە زۆر وردە و ڕۆحیانەتێکە کە تێکەڵی هەوا دەبێت، و بە کونیلەکانی لەشدا دەچێت."

لادانێکی (ناتەواو) بەرەو باوەڕبوون بە درم خۆی پەخشدەکرد لە جولان بەرەو جیاکردنەوە و دابڕاندنی مرۆڤ و شتمەک(Quarantine)، سنووردارکردنی گەشتکردن، قەدەغەکردنی کۆبوونەوەی گشتی وەکو ڕێپێوانی ئاینی، و بە شێوەیەکی گشتی زیادبوونی دەسەلاتی حکومەت لەسەر ژیانی کەسانی نەخۆش یان گومانلێکراو.

لە باکووری ئیتالیا، کە ئەم ڕێکارانە لە پێشەنگدابوون، لیژنەکانی تەندروستی یاسایان دەسەپاند لەسەر تەندروستی کۆمەڵ لە کاتی تاعووندا. بە زۆریش کاریگەرییەکی کەمیان هەبووە: تاعوون هەر دەهاتەوە.




١.	ئەم نەخشاندنە لە ساڵی ١٦٥٦ سومبولی پزیشکی تاعوون پیشاندەدات کە دەمامکێکی پارێزەری لەبەرکردووە کە پڕکراوە لە گیا بۆ خۆپاراستن لە پەتا.

ئەوەی کە ڕەنگدانەوەی هەبووە و دووپاتکراوەتەوە، هەر چۆنێک بێت، بریتیبووە لە دەرکەوتنی پەیوەندی نێوان نەخۆشییەکە و هەژاری. هیچ کات تێپەڕنەبووە تێبینی نەکرێت کە تاعوون لە ئیتاڵیا و فەڕەنسا و ئینگلستان تووشی هەژاران بووە زیاتر لە دەوڵەمەندەکان.

نووسینی جێماوی دوایین سەرهەڵدانی گەورەی تاعوون لە مرسیلیا لە ساڵی ١٧٢٠، یەکێک لە پزیشکەکان دەربارەی گەڕەکێکی دەوڵەمەند دەڵێت: "شەقامەکان فراوانبوون، خانووەکان گەورەبوون، هەروەها بە شێوەیەکی سەرەکی خەڵکانی دەوڵەمەند و هەبووی تێدابوون کە ئەوانە هەمیشە لە کۆتایدا لە لایەن درمەوە هێرش دەکرایە سەریان، کە بە پێی توانستیان بوو بۆ خۆ دانان لە شوێنی دوور لە تاعوون."لە ئەو کاتانەی کە زۆرێک بۆچوونیان وابوو، تاعوون پەڕۆکە و نەخۆشی هەژارانە، دەوڵەمەندان بە توندی دەستیانکرد نارەزایی و نیگەرانبوون دەربارەی ڕێڕەوی نەخۆشییەکە لە نێوان چینەکانی خەڵکیدا. تاعوون بووە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی و بوو بە هێمایەک بۆ دابەشبوون لە نێوان دەوڵەمەند و هەژاراندا. ترس لە تاعوون و ترس لە هەژاران دەست لە ناو دەستبوون.

سروشتی پەڕۆکی تاعوون کاریگەری لەسەر بازرگانی هەبوو، ئەمەش پەیوەست بوو بەوەی کە ویلایەتە ئەوروپییەکان هەوڵیاندەدا بۆ سەپاندنی دابڕاندن بەسەر شتومەکدا. دابڕاندنی دەریایی بۆ کۆتاییەکانی سەدەی چواردە دەگەڕێتەوە، کە بۆ یەکەمین جار لە بەندەری دوبرۆڤینک سەپێندرا. بە تێپەڕبوونی کات، سەرەڕای ئەو مشتومڕانەی دەکران و ئەگەری ئەوەی مەرجیش نیە کە

کاریگەربێت، بەڵام دابڕاندن بوو بە کارێکی بنەڕەتی. دابڕاندن بە تەنها بۆ کەلوپەل جێبەجێنەکراوە؛ هەروەها خەڵکیش، لەوانەیە زۆرجار، دەستبەسەرکرابن.

پەیوەندی نێوان بازرگانی، گەشتکردن، و تاعوون درێژخایەن بوو، چونکە زۆرێک بۆچوونیان وابوو کە تاعوون لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە و نەخۆشییەکی پەڕۆکە، بۆیە دەستبەسەراگرتنی شتمەک و ڕاگرتنی خەڵکی ئەو بەشەی جیهان ئەوندە سەرنجڕاکێشبوو کە بۆ ئەنجامدانی خۆیان پێ نە دەگیرا.بارودۆخەکە لە جیهانی ئیسلامیدا بە ئەو شێوەیە نەبوو، بە جۆرێک پەڕۆکی زۆر قبوڵکراونەبوو، هەروەها توانای کارگێڕی بۆ دابڕاندن بوونی نەبوو لە ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی. هیند، چین و وڵاتەکانی دیکە زۆرجار وەکو سەرچاوەی تاعوون ئاماژەیان بۆ دەکرا، ئەمانیش دابڕاندنیان جێبەجێنەکرد. بە ئەم شێوەیە لەسەر ویلایەتە ئەوروپییەکان بوو، بە تایبەت لە دەریای سپی ناوەڕاست کە خۆیان پاسەوانی سنوورەکانی خۆیان بکەن.

هەستی ئەوەی کە نەخۆشیەکە لە ڕۆژهەڵاتەوە گەشتووە و ئەو باوەڕەی کە هیچ شتێک ئەنجام نەدراوە بۆ کەمکردنەوەی جووڵەی تاعوون، بە تەنها خێراکردنی دابەشبوونی نێوان ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای لێکەوتەوە_دابەشبوونێک کە زۆر بەهێزتر گەشەدەکات لە کاتی پانەپەتای کۆلێرا لە سەدەی نۆزدە.

هەموو ویلایەتەکان بە هەمان هێز خاوەنداریەتیان لە دابڕاندن نەکرد. وەکو ئەو ویلایەتانەی کە نزیکبوون لە سەرچاوەکانی تاعوون. ئەوەی گرنگبێت بریتییە لە دروستبوونی پەیوەندی نێوان توانای دەوڵەت بۆ

دەسەڵاتداری و توانای بۆ پاراستنی خەڵکەکەی لە بڵاوەپەتاکان. ئەمەش لە کۆتایی سەدەی شازدە زۆر بەهێز لە شارە دەوڵەتەکانی ئیتاڵیا کە لە ترۆپکدابوو، هەستی پێدەکرا، کاتێک تاعوون هەموو ئیتاڵیای گەمارۆدا بە تایبەت لە ساڵی ١٥٧٥-١٥٧٨. ئیتاڵیا هەوڵیدەدا بۆ جڵەوکردنی تاعوون لە ڕێگەی پەرەپێدانی پاکوخاوێنی، جڵەوکردنێکی توندی جووڵەی خەڵک و شتمەک_بە تایبەت لە دەرەوە_زیادبوونی زانیاری دەربارەی سەرچاوەی بڵاوەپەتا، هەروەها دروستکردنی لیژنەی پاکوخاوێنی زیاترو زیاتر کە پێشتر هیچ لە ئەمانە نەبوو وای لە ئیتاڵیا کرد بێ هاوتا بێت. بەڵام لە هەموو شوێنەکانی دیکەی ئەوروپا دەستیانکرد بە گرتنەبەری ڕەوتەکەی ئیتاڵیا_کاریگەری ئیتاڵیا ڕوونە لەسەر فرمانەکانی تایبەت بە تاعوون لە بەریتانیا لە ١٥٧٨_بە تایبەت ڕێکاری جیاکردنەوە و دابڕاندن، کە زیاترو زیاتر باوەبوون.

سەرەڕای ئەو هەوڵە سەرەتاییانەی دەوڵەت بۆ جڵەوکردنی بڵاوەپەتاکان، زۆرجار هەوڵەکان لاوازدەکران بە هۆی جێبەجێکردنی سست، سنوورە لاوازەکانی دەوڵەتان، هەروەها فشاری بازرگانان بۆ لابردنی کۆتوبەند لەسەر گوزەرانیان. ئەمە هەبوو لە شارە دەوڵەتەکانی ئیتاڵیا کە بچوکبوون، و دانیشتوانەکانیان خاوەنی چەندین سەدە شانازین لە شارستانی و ئاسایش. جێبەجێکردنی ڕەوتێکی وەها لە فەڕەنسا، کە زۆر گەورەتر و فرە چەشنتربوو، لە خۆیدا ئاڵنگارییبوو.

تەنانەت کاتێک کە دابڕاندنی دەریایی لە کاردابوو، وەکو لە ساڵی ١٦٦٤ لە لەندەن، تاعوون ڕێگای خۆی کردەوە لە

وڵاتـانی باشـوورەوە، دابڕانـدن هەمیشـە کـاریگەر کـاری نەدەکـرد، ئەو سـاڵە و دوو سـاڵی دواتـر لەنـدەن خراپتـرین بڵاوەپەتای بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەک چەشت.

لە ڕووی بیـــردۆزەوە، جیـــاکردنەوەی ناومـــاڵ بـــۆ نەخۆشـەکان بیرۆکەیەکـی باشـبوو؛ بەڵام لە کـرداردا تەنهـا کەمێـک کـرا: قوربانیەکـانی تـاعوون فەرمانەکـانی مانەوەیـان فەرامۆش دەکـرد، ئەم فەرامۆشـکردنەش بەلای زۆرێکیـانەوە کـارێکی سـادەبوو.دابڕاندن وەکـو ڕێکارێـک لە ڕێکارەکـانی تەندروسـتی گشـتی و کاریگەریەکـانی لەسـەر بازرگـانی لە سـەدەی هەژدە توشـی هێـرش و تـوانجی بەرچـاو دەبـنەوە، وەکـو ئەوەی سـەدەی هەژدە سـەدەیەکی دواکەوتووبێـت بەراورد بە سـەدەکانی پێشـتر. ئەگەر بتوانرێـت سـەرەتای دووەمـین پانەپەتـای تـاعوون بە وردی بـۆ سـاڵی ١٣٤٧ و هاتنی مەرگی ڕەش دابنرێت، ناتوانرێت هەمان شت بوترێت دەربـارەی دیاریکردنی بەرواری سـاڵانی کۆتـایی پانەپەتـاکە. چـونکە پەتـاکە بەهێواشـی کۆتـایی هـات، و شـوێنێکی چۆڵـدەکرد پاشـان شـوێنێکی دیکە و هەرگیـز نەدەگەڕایەوە. تـاعوون بـۆ کۆتـا جـار دای لە ئینگلسـتان لە سـاڵی ١٦٦٥-١٦٦٦، کاتێک کە هەشتا هەزار لەندەنی کوشت، نیو سـەدە دواتـر دوایـن دەرکەوتنـی لە ڕۆژئـاوای ئەوروپـا لە مرسـیلیا بـوو. پـانزە سـاڵ دواتـر مۆسـکۆ خـانەخوێی دوایـین پەتـای تاعوونی ئەوروپی بوو.

لە میسـر بە درێژایـی سـەدەی هەژدە جـار لە دوای جـار تـاعوون لێیـدەدا، کە بە نـزیکەی ٪٢٠ دانیشـتوانە سـێ سـەد هەزارییەکەی قاهیرەی لە مـاوەی پەتـای سـەرەکی لە سـاڵی ١٧٩١ لەناوبرد.

له ئیمپراتۆریەتی عوسمانی تاعوون تاکو سەدەی نۆزدە بەردەوامبوو. بۆ ماوەی پتر لە سێ سەد ساڵ تاعوون کاریگەری دەنا لەسەر بیروباوەڕی ئاینی و بیردۆزەکانی گواستنەوەی نەخۆشی، هەر وەکو چۆن کاریگەری هەبووە لەسەر ئاماری دانیشتوان و ئابووری؛ هەروەها تاعوون لەگەڵ خۆیدا یەکەمین ڕێکاری تەندروستی گشتی پاڵپشتیکراوی لە لایەن دەوڵەتەوەی پێشکەشکرد، دواتر تاعوون نەما. کاتێک سەیری نەمانی دەکەین لە کاتەکانی سەرەتای جیهانی هاوچەرخەوە، تاعوون وا دەردەکەوێت کە بەرەبەرە کۆتایی پێ هاتبێت_خۆ ئەوەتا، ماوەی نێوان پەتای لەندەن و ئەوەی مۆسکۆ پتر لە سەدەیەک بووە، بەڵام کاتێک بە شێوەیەکی ناوخۆیی و لە ئاستی وڵاتان لێی دەڕوانین، وا دەردەکەوێت کە نەمانی تاعوون لەناکاوبووبێت. بۆ نموونە ئینگلستان تاکو ساڵانی دەیەی ١٣٤٠ تاعوون بە شێوەیەکی ڕێکوپێک لێیدەدا. پاشان دواهەمین دەرکەوتنی سەرسوڕهێنەری خۆی ئەنجامدا لە ساڵی ١٦٦٥-١٦٦٦ و هەرگیز نەگەڕایەوە. بۆ فەڕەنساش هەمان شت ڕاستە: پاش چەندین سەدە کە هیچ ساڵێک خاڵی نەبووە_لە تاعوون، وەلێ پەتاکەی مرسیلیا لە ساڵی ١٧٢٠ دواهەمین بوو. چی ڕوویدا؟ لەوانەیە مشکەکان پەرەیاندابێت بە بەرگری لەشیان، و تاعوونیان لە ڕێڕەوەکەیدا وەستاندبێت، یان لەوانەیە جۆرە سەرەکیەکانی مشک گۆڕابن، یان لەوانەیە ئەو گۆڕانکاریە کەشوهەوایانەی ئاسیای ناوەڕاست کە لەوانەیە جار لە دوای جار هۆکاری دەرکەوتنی تاعوون بووبێتن کۆتایان هاتبێت. زیاتر لەسەری بڕۆین، سەرەڕای ئەوەی لە زۆربەی بارەکاندا

دابڕانــــدن(Quarantine) كـــاریگەری نەبـــووە لەوانەیە بە تێپەڕبوونی كات و لە ماوەی درێژخایەندا كاری كردبێت بۆ وردە وردە خاوكردنەوەی بڵاوبوونەوەی تاعوون.

دوای ســاڵی ١٦٦٦ ئینگلســتان دەســتیكرد بە ســەپاندنی دابڕانــــدن بەشــێوەیەكی تونـــدتر؛ تـــاعوونیش هەرگیـــز نەگەڕایەوە. وەلێ چونكە تاعوون بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ و لە زۆر شوێنی جیاواز بەردەوامبوو و بە كاتی جیاوازیش كۆتـایی هــات، ناكرێــت بە تەنهــا یەك هۆكــار بــۆ نەمــانی نەخۆشییەكە دیاریبكرێت.

یـادەوەرییە مێژوویەكـان كـاڵنەببوونەوە، كاتێـك پەتـای تـــاعوون دووبـــارە لە ســـاڵانی دەیەی ١٨٩٠ دەركەوتەوە. هەروەهــا مــاتەڵبوون لەگەڵ پانەپەتــای كــۆلێرا لە ســەدەی نۆزدە ئەوەی هێنـایەوە یـادی ئەو وڵاتـانەی كە ئەزموونیـان لەگەڵ تــاعوون هەبــووە كە مــامەڵەكردن لەگەڵ نەخۆشــی پەتایی چی دەگەیەنێت؛ كاریگەریەكانی تـاعوون بە جۆرێـك گەورەبــوون زۆرێــك لە ئەو ڕێگەچــارانەی لە دژی كــۆلێرا بڵاوبـــوونەوە لە مـــاوەی دووەمـــین پانەپەتـــای تـــاعوون پەرەیانپێـــدرابوو، كەواتە، بە پـــێچەوانەوە، ئایـــا دەكرێـــت ئەزمـــوون لەگەڵ پانەپەتـای كـۆلێرا كـاریگەری هەبووبێـت لەســـەر ئەو ڕێگایـانەی كە گیـرانەبەر بـۆ ئەوەی سـێیەمین پانەپەتای تاعوون بخرێتە ژێر ڕكێف و جڵەوبكرێت.

پانەپەتــای ســێیەم لە باشــووری چــین لە ســاڵی ١٨٩٠ دەستیپێكرد. هەر ئەو ساڵە، تـاعوون بە درێژایـی ڕووبـاری كانتۆن بڵاوبووەوە، و گەشتە شاری گوانگدۆنگ و دواتریش گەورەتـرین شـاری بازرگـانی لە باشـووری چـین، گـوانغزۆ. هەر لە ئەوێـوە دووریەكـی كەمـی بـڕی لە هۆنـگ كۆنـگ و

ئەولاتری. لە ماوەی دەیەکەدا تاعوون لە زۆربەی جیهان بڵاوبووەوە، کە بڵاوبوونەوەکەی لە شارە بەندەرەکان خەستببووەوە.

کیپ تاون، سیدنی، هۆنولولو، سان فرانسیسکۆ هەموویان تاعوونیان چەشت. هەروەها هەمان شت بۆ ریۆ دی جانیریۆ و بۆینس ئایرس هەبوو.لە شاری ئۆپۆرتۆ لە پرتوگال، دابڕاندنی دەریایی چالاکی بازرگانی شارەکەی وەستاند. هەر چەند مەرگباری لە ئەو شارانەدا بەنزیکەیی کەمبوو، بەڵام ترس و نیگەرانی زۆربوو_هەشتا هەزار کەس لە هۆنگ کۆنگ هەڵاتن؛ لە کێپ تاون و سیدنی دابڕاندن بووە نمایندەی جێبەجێکردنی سیاسەتی نەژادی بۆ بەڕێوەبردنی دانیشتوانە ئەفریقیە ڕەش پێستەکان و چینیەکان؛ هەروەها ڕێکاری توند گیرایەبەر بەرامبەر چینیەکان لە سان فرانسیسکۆ و هۆنولولو.

تاعوون لە زۆربەی بەشەکانی باکوورو ڕۆژئاوای هیندستان ڕێگەی خۆی کردەوە، کە بە نزیکەیی لە ئەوێ دوازدە ملیۆن کەسی کوشت.سێنیگال لە ساڵی ١٩١٤ بووە قوربانی سێیەمین پانەپەتای تاعوون، بۆ سی ساڵی دادێ، تاعوون ئاڵانگاری کارگێڕی داگیرکاری فەڕەنسی لە وڵاتەکە کرد. لە مەنچوریا لە باکووری ڕۆژهەڵاتی چین شێوەیەکی کوشندەی پەتای تاعوونی سییەکان هەڵکشا لە ساڵی ١٩١٠.

سێیەمین پانەپەتای تاعوون، گەڕانەوەی مەرگی ڕەش نەبوو. جگە لە جیاکاریەکی بەرچاو نەبێت لە هیندستان، مەرگەسات زۆر کەمتربوو_جا لەوانەیە توندی نەخۆشیەکە کەمتربوبێت، یان لەوانەیە ڕێکارەکانی تەندروستی گشتی بەهێزبووبن.

سیستەمی چاودێری، دابڕاندنی دەریایی و جیاکردنەوەی قوربانیەکـــان_هەموو ئەوانە و زیــاتریش وەگەڕخــران، هەنــدێک جــار بە شــێوەیەکی دڕنــدانە و فــرە تونــد، بــۆ جڵەوکردنی تاعوون.

لە ئەسکەندەریە لە میسر، لە جیاتی ناچارکردنی خەڵک بـۆ پابەنـدبوون بە ڕێکـارە توندەکانی تەندروسـتی گشـتی بەرپرسـان و پیاوماقوڵانی ناوچەکانیان خستە ئەرکەوە بۆ بەدەسـتهێنانی متمانە و هاوکاری هاوڵاتیان. لە ئەنجامدا لە ترسـی کۆمەڵ دووربوون، و بڵاوە پەتاکەی ئەسـکەندەریە دامرکا لە چەند مانگێکی کەم.

ڕێـڕەوی خێـرای پانەپەتـا فەراهەمبـوو بە هـۆی خێـرا گەشەسەندنی تۆڕەکانی بازرگانی جیهانی و کۆچی مرۆیی بە هۆی کەشتیگەلی هەڵمی کە خێراتربوون لە هەر کاتێکی تر و زۆربوونێکی گەورە لە هێڵی شەمەندەفەر.



٢. تاوانباران کاردەکەن بۆ پاکژکردنی کیپ تاون لە ماوەی سێیەم پانەپەتای تاعوون لە ساڵی ١٨٩١.

پەیوەندی نێوان بازرگانی، کۆچ، نەخۆشی بڵاوەدرمەکان_هەروەها پێویستی پەرەپێدانی هاوکاری نێودەوڵەتی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکە لە سەدەی نۆزدە لە ئەنجامی پانەپەتای کۆلێرا _دیارکەوت. کاتێک تاعوون گەڕایەوە پەیوەندیەکە زیاتر دیارکەوت، جارێکی دیکەش ئەو کاتەی کە پانەپەتای ئەنفلۆنزا جیهانی تەوقکرد.

تاعوون گەڕایەوە لە ماوەی شۆڕشی تاقیگەیی. هەر لە سەرەتایەکی زووی پانەپەتا لە ساڵی ١٨٩٤، ئەلیکساندەر ئێرسین، کە زانایەکی سویسری_فەڕەنسی بوو، لەگەڵ توێژەری یابانی شیباسبوور و کیتاستو، کە سەربەخۆیانە کاریاندەکرد، هەردووکیان بەکتریای چیلکەی تاعوونیان دۆزیەوە بە جیاوازی دە ڕۆژ لە نێوانیاندا. دوای ئەوەی کە تاعوون ڕێگەی خۆی لە نێو جیهان خۆشکرد و بڵاوبووەوە، یەکەم جار زانای فەڕەنسی پاوڵ لویس سایمۆند کاتێک کە لە بۆمبای لە ساڵی ١٨٩٨ کاری دەکرد، پێشنیاریکرد و ئەو بیرۆکەیەشی هێنایە گۆڕێ _ کە تاعوون دەگوێزرێتەوە لە ڕێی کێچی زیندە لەسەر مشکان. بە ئەمەش کۆتایی هێنا بە مشتومڕەکان لەسەر ئەوەی کێ تاعوون دەگرێت و بۆچی و چۆن دەگوێزرێتەوە، کە تێزەکانی لەسەر تاعوون بۆ ماوەی چەندین سەدە گرفتار کردبوو.

دۆزینەوەی بەکتریای چیلکەیی تاعوون پێناسی نەخۆشیەکەی گۆڕی. ئەمەشی کرد بە ڕێگەیەکی زۆر سەرەتایی و تاڕادەیەکیش کتوپڕ: ئەو تاعوونەی کە لە ساڵانی دەیەی ١٨٩٠ گەڕایەوە و لە ژێر وردبینندا دیاریکرا لە ساڵی ١٨٩٤ ئاشکرا، و ناسراوبوو، ئەگەر بە تەواوەتیش

هەستپێکراو نەبووبێت؛ لە کاتێکدا ئەو تاعوونەی کە هەر لە سەدەی شەشەوە وێرانەی خستبووە نێو کۆمەڵی مرۆڤان نەبینراو و نەناسراوبوو.

پاش دەستنیشانکردنی بەکتریاکە هەموو ئەمانە گۆڕان، تاعوونی نێو مێژوو بوو بە شتێکی ناسراو لە ڕێگەی نیشانەکانی نەخۆشیەکە.

هەریەک لە ئێرسین و کیتاتسۆ بانگەشەی دۆزینەوەی هۆکاری تاعوونی سەدەکانی ناوەڕاستیان دەکرد، کە ماوەیەکی درێژە پێی دەڵێن بەکتریای *ئێرسینیا پێستیس* *Yersinia pesties*. و تێگەشتنی نوێ بۆ تاعوون لەسەر بنەمای تاقیگەیی دەسەپێنرێت بە سەر ڕابردووشدا. وەلێ تێڕوانینی نوێ بۆ تاعوون کێشەی دەسنیشانکردنی نەخۆشیەکەی نێو مێژووی دیارخست. ئاخۆ ئێمە چۆن بزانین ئەو نەخۆشییەی کە دای لە قوستەنتینیە لە ساڵی ٥٤٢ و ئەڤیگۆن لە ساڵی ١٣٤٩ و لەندەن لە ساڵی ١٦٦٥ هەمان ئەو نەخۆشیەیە کە ئێستا زانراوە کە هۆکارەکەی بەکتریای ئێرسینا پێستیسە؟ هەندێک لە مێژوونووسان و زیندوەرناسان دەڵێن هەمان شت نین و دڵنیایی دەدەن لە هەبوونی جیاوازی لە توندی نەخۆشیەکە؛ هەروەها ئەوان دەڵێن ناکرێت مشکەکان ئەوندە بە خێرایی گوزەریان کردبێت کە بەسبێت بۆ بڵاوکردنەوەی تاعوون بە ئەو شێوەیە خێرایە. دووبارە ئەوان ئاماژە دەکەن بۆ نەبوونی نیشانەی_هاوشێوەی ئەوانەی تاعوون لە هەندێک حاڵەتەکاندا، و نەبوونی هیچ بەڵگەیەک دەربارەی بە کۆمەڵ لەناوچوونی مشکان.

دۆسیەکەیان لەسەر بنەمای جیاوازی نێوان تاعوونی سەردەمی هاوچەرخی پاش_تاقیگە و سەردەمی پێش هاوچەرخ، پێش_تاقیگەبوو. جیاوازییەکانیش ئەوەندە بەهێزن کە ناکرێت هەمان نەخۆشی بن.

ئەوانەی وا بیردەکەنەوە کە ئەم دوو نەخۆشیە یەکن و هەمان شتن پشت بە لێکچوون دەبەستن: ئەوەتا نیشانەکان هاوشێوەن، بە تایبەت بوونی ئاوسانی دیار لە بن باڵەکان، پەناڕان، و مل کە پێیان دەڵێن لوو. ئەوە خەریکە مسۆگەر دەبێت کە زۆر لە شوێنەکان، گەر هەمووی نەبێت، کە پێشتر ئەزموونی تاعوونیان کردبووبێت ، مشک و کێچی زۆریان تێدابووە.

وەکو تاعوونی هاوچەرخ، تاعوونەکانی ڕابردوو_بەڕادەیەک کە دڵنیاین_یەکەم جار ڕێگەی خۆیانکردۆتەوە لە ڕێگەی دەریاوە، کە ئەمەش پێشنیاری بوونی مشکەکان لەسەر کەشتیەکان دەکات.

هەروەها، پشتیوانانی بیردۆزەی تاعوون پێداگری دەکەن و دەڵێن دەکرێت هۆکاری نەخۆشی بگۆڕێت، بە ئەمەش مایەی سەرسوڕمان نییە کە تاعوونی ڕابردوو جیاواز دیاربکەوێت لە هەندێک ڕووەوە بەراورد بە تاعوونی دەستنیشانکراو لە ماوەی پانەپەتای سێیەم.

کەواتە، نەخۆشیەکە چییە؟ تاکو ئێستا زۆربەی مێژوونووسان و بۆماوەناسان، و زیندەوەرناسانی گەردی پشتگیری ئەو بیرۆکەیە دەکەن کە تاعوون هەمیشە ئێرسینا-پێستیس بووە. یەک هۆکار بۆ ئەمە دەرکەوتنی بەڵگە لە سەرچاوەی DNA و دەرکەوتە لە گۆڕەکانی

چاخی کۆن، هەروەها لە درەنگانی چاخی ناوەڕاست و سەرەتاکانی چاخی هاوچەرخ.

پەیوەندی نێوان تاعوون و بازرگانی هەر لە سەرەتای دەرکەوتنیەوە لە سالانی دەیەی ١٣٤٠ بە باشی زانرابوو لە ئەنجامی بازرگانی شاری جینوا لەگەڵ ڕۆژهەلات. لە سالانی دەیەی ١٨٥٠ بۆ کۆتایی سەدەی نۆزدە کۆمەڵگای نێودەوڵەتی تازە دەرکەوت و هەوڵیدا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بڵاوبوونەوەی نەخۆشیە درمیەکان لە چوارچێوەی بەستنی زنجیرەیەکی یەک لە دواییەکی کۆنگرەی نێودەوڵەتی تەندروستی. هەروەها کاتێک سێیەم پانەپەتای تاعوون گەیشت، بە نێودەوڵەتیبوونی زانستی گەیشتە جۆرێک لە لوتکە. کە دەوڵەمەندە بە نموونەی وەکو بەستنی کۆنگرەی نێودەوڵەتی تەندروستی لە شاری ڤێنیسا لە سالی ١٨٩٧، کە تێیدا نوێترین ئاگاداری زانستی لەسەر تاعوون گەشتە دیدەنی ویستێکی قوڵ بۆ شلکردنی سنووردارکردن لە سەر بازرگانی. ئایا دەکرێت زانست خزمەتی بازرگانی بکات؟

گۆنگرەکەی ڤێنیسا ئاستێکی بێوێنەی لە هاودەنگی کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی پیشاندا.

سەرۆکی جڤاتی درمناسی لەندەنیش دەربارەی پەیمانی گۆنگرەکە وتی "پێشکەوتنێکی گەورە هەیە لە لایەن نەتەوەکانەوە بەرەو تێگەشتنی بیری ئازاد و زانستی ڕاستەقینە دەربارەی ڕێگە چارەکان بۆ لە خۆگرتنیان لە لایەن حکومەتە دیارکراوەکانەوە بۆ نەهێشتن و جڵەوکردنی نەخۆشیە درمیەکان." لە مەڕ هەوڵدان بۆ ڕاگرتنی نەخۆشیەکە لەگەڵ بەلاوەنانی دابڕاندن وەکو ڕێگەیەکی کاریگەرتر چاودێریی و هەواڵپێدان گیرانەبەر.

ئەگەر زانیاری بزانرایە دەربارەی شوێنی نەخۆشیەکە، ئامانجی کاردانەوەکانی وەکو سنووردارکردنی کۆچ و دابڕاندنی بەندەرەکان لە شوێنی سەرهەڵدانی نەخۆشیەکە وەگەڕدەخران نەک سنووردارکردن و سەرکوتکردنێکی فراوان کە ترس و نەبوونی زانیاری سروشتی پێدابوو.

وەلێ هەموو گەلەکان پابەندی پەیمانی کۆنگرەکە نەبوون_پۆرتوگال و ئیسپانیا پەنایان بۆ ڕێکارە کۆنەکان برد، کە ئاشکرایانە پێچەوانی ئازادیبوو وەکو گەمارۆی سەربازی بێ کاریگەر لە دەوروبەری بەندەرەکان_بەڵام ئەوانەی پابەندبوون، وەکو میسر، هەر زوو هەڵگرتنی سنوورداری بازرگانی بە خۆوە بینی. کۆدەنگیەکە هێشتا تاکو شەش ساڵی دواتر بەردەوامبوو، لە کۆنگرەی ساڵی ١٩٠٣ کە لە پاریس بەسترا، لە ئەو کاتەوە سەرنج گۆڕدرا و خرایە سەر مشکەکان وەکو هەڵگری نەخۆشیەکە. کە لەلای خۆیەوە بووە هۆی سەرنج خستنەسەر وەستاندنی تاعوون لە دەروازەکانی کۆچکردن. ئەمەش بە دڵنیایەوە پشت دەبەستێت بە هەردوو توانای ناوخۆی و بایەخدان بە دوو شت کە زۆرترین بۆچوونیان لەسەرە کە پێویستن بۆ جڵەوکردنی تاعوون: چاکسازی تەندروستی و بوونی هۆکاری بەهێز بۆ وریاکردنەوە و هەواڵپێدان لەسەر نەخۆشی. لە هەموو جیهاندا هەردوو سیاسەتەکە تەنها بەشێوەی نارێک لە بووندا هەبوون.

دەسەڵاتی پزیشکی بەسەر بازرگانی لە هیندستاندا ئاشکرابوو، هەروەها دەسەڵاتەکە لە ئەوپەڕیدابوو کە تاعوون بە توندترین شێوە لە وڵاتەکەیدا لە ماوەی

پانەپەتای سێیەمدا. هەر لە کاتی گەشتنیەوە لە بۆمبای لە ساڵی ١٨٩٦، تاعوون ئاڵانگاری توانای دەوڵەتانی داگیرکاری بەریتانی دەکرد بۆ بەڕێوەبردنی نەخۆشیەکە و گومانی وروژاند لەسەر پشتبەستنی نوێ بە زانستی پزیشکی. کاردانەوەی سەرەتا ئاستێکی بێ هاوتابوو لە دەستێوەردان لە ژیانی ڕۆژانەی هیندەکان و لە ساڵی ١٨٩٧ لە سایەی یاسای نەخۆشیە درمیەکان گەشتە ترۆپک. نیازمەندی ڕازیکردنی دواکاریە نێودەوڵەتیەکان کە بەریتانیا تاعوون بوەستێنێت لە بڵاوبوونەوەی بۆ ئەوروپا، دەسەڵاتی تەواوەتی بە بەرپرسانی داگیرکاردا بۆ پشکنینی کەشتی، دابڕاندنی گەڕەک، سنووردارکردنی گەشت و کۆبوونەوەی ئاینی، و ڕێکارەکانی دیکەی تەندروستی.

یاسا مۆڵەتی دایە دەسەڵاتداران بۆ تاقیکردنەوەی هەر شتێک کە ئەوان وای بۆ دەچن کاریگەری هەبێت. ئەمەش لە لای خۆیەوە دەسەڵاتێکی نوێی بە زانستی پزیشکی بەخشی کاتێک کە بەڕێوەبەرانی داگیرکاری ڕێگە بە پزیشکان و شارەزایانی تەندروستی دەدەن بە شێوەیەکی نائاسایی کاریگەریان لەسەر سیاسەت هەبێت. ئەو سیاسەتانەش_قانگدان و سوتاندنی خانوو؛ بە زۆر ناردن بۆ ئەو نەخۆشخانانەی کە زۆرێک لێی دەترسان، لە نێوان شتەکانی تردا، نەریتی تیرەکان پەیڕەو نەدەکرا؛ ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن قەدەغەکرا. پشکنینی پاش مەرگ؛ و گۆشەگیرکردنی توندی نەخۆش_بووە هۆی گەورترین بەرهەڵستی بەرامبەر پزیشکی ڕۆژئاوا لە سەدەی نۆزدەی مێژووی هیندستان.

مەهاراتا، ڕۆژنامەیەکبوو بە زمانی ئینگلیزی لە شاری پونێ بڵاودەکرایەوە، نووسیبووی بەریتانیەکان هەرگیز "بە شێوەیەکی بەرفراوان و ڕێکخراوەیی دەستێوەردانیان لە نەریتی ناوخۆیی و کۆمەڵایەتی و ئاینی خەڵک نەکردووە." یەکێک لە بێزراوترین کردە، کە چەخماغەی توندترین کاردانەوەکان بوو، بریتیبوو لە جیاکردنەوەی خێزانەکان، بە تایبەت دوورخستنەوەی ئافرەتان بۆ ئۆردوگاکانی دابڕاندن.

لە شاری پونێ، کردەی زۆر بێزراو بریتیبوو لە پشکنینی ئافرەتان لە شەقامەکان و چەند بارە گەڕان لە ماڵەکاندا لە لایەن سەربازە بەریتانیەکان کە بە هۆی ئەم کردانەوە بریکار دەبلیو.سی. ڕاندا لە مانگی پێنجی ساڵی ١٨٩٧ کوژرا. ساڵی دواتر، تەنانەت دوای گرتنەبەری ڕێکاری توند، بەرهەڵستی گەشتە لوتکە: ئاژاوە لە هەموو باکووری هیندستان هەڵگیرسا وەک کاردانەوەیەک بۆ پشکنینی ماڵان، دابڕاندن، لە نەخۆشخانە خستن.

دەسەڵاتدارانی داگیرکار ناچاربوون بۆ شلکردنەوەی جەنگان لەگەڵ تاعوون، دانیشتوانەکە توانای داگیرکاریان هێنایە لەرزین؛ بەکارهێنانی هێزی سەربازی لێکەوتنەوەی دەرئەنجامی پێچەوانەی سەلماند. بۆیە هاوکاری نەک دژکاری لەگەڵ هیندەکان لەوانەیە باشتربێت.

بریکاری تەندروستی ئەوەی بۆ دەرکەوت "ئەزموون دەستدەکات بە پیشاندانی ئەوەی کە ئەوەی لە ڕووی پزیشکیەوە خوازراوە، لەوانەیە لە ڕووی جێبەجێکردنەوە ئەستەم بێت، لە ڕووی ڕامیارییەوە مەترسیداربێت."

پاش ئەم گۆڕانکاریە، گیانی هاوکاری لە نێوان هیندەکان و بەرپرسانی داگیرکاری تەنانەت لە پونێش دەرکەوت، کە مەترسیدارترین بەرهەڵستی لە ئەوێ ڕوویدا. کاتێک کە لیژنەی تاعوونی هیندستان لە ساڵی ١٩٠٠ ڕاپۆرتێکی دەرکرد، ئاماژەی بە ئەوەکردبوو کە گۆڕینی زۆرەملێ بە ئاشتەوایی کاریگەربووە.

ئەوەی بەرهەڵستی پەردەی لەسەر هەڵماڵی و ئەوەی ئاشبەتاڵی لە سەردەمی هاوکاری کرد بریتیبوو لە نەبوونی متمانە بە پزیشکێتی ڕۆژئاوا، ئەو ڕاستیەیەی، کە بەریتانیەکان، سەرەڕای کەشو فشیان، لە ڕاستیدا هیچ چارەسەریان پێ نەبوو بۆی.

ئیتر هەرگیز ئەوان ناتوانن تێڕوانینەکانی خۆیان بە ئەو شێوەیە بە سەر هیندەکاندا بسەپێنن.

پێشنیاری ئەوەی کە ئەمە لەوانەیە سپێدەی سەردەمی هاوکاری و یەکسانی بێت لە نێوان بەریتانیا و هیندستان بەدرۆ دەخرێتەوە بە هۆی پێشەکەوتنەکانی داهاتووەوە لە هیندستان دوور لە دەسەڵاتی بەریتانیا.

دەسەڵاتی داگیرکاری بەریتانی لە مامەڵەکردنی سەرتادا لەگەڵ تاعوون ئەو خاڵەی بۆ دەرکەوت کە دەوڵەت تەنها بە هێز دەتوانێت بیرۆکەکانی بسەپێنێت. کاتێک ئەم بەکارهێنانی هێزە دەرئەنجامی پێچەوانەی لێکەوتەوە و بەریتانیەکان ناچارکران کە ڕازیبن بە شکستەکانیان. لە ئەمەشدا ئەوە دەرکەوت کە دەوڵەتی داگیرکاری و پزیشکێتی ڕۆژئاوا ئەوەندە بەهێزنەبوون وەکو باسدەکران.

بەهاتنی جەنگی جیهانی یەکەم پانەپەتای سێیەم لە ژێر جڵەودابوو یان کفتکرابوو. بەڵام تاعوون لەناونەچوو. هەر

چەنـدە ئێستا نەخۆشـیەکە بە دەرمانەکـانی دژە بەکتریـا چارەسـەر دەبێت. ئەمەش دەبێت بەخێرایـی ئەنجـام بـدرێت، چونکە تاعوون درمە و بە خێرایی بڵاودەبێتەوە.

تـاعوون لە هەندێک بەشـی ئەفریقیـا و ئاسـیادا بـۆ چەنـد دەیەیەکـی زیـاتر مـایەوە؛ سـەرهەڵدانەکانی سـاڵانی دەیەی ۱۹۹۰ لە هیندستان و هەروەهـا سـەرەتاکانی سـەدەی بیست و یەک لە مەدەکەشکەر بە بیری هەموو جیهان دەهێنێتەوە کە ئەم نەخۆشـیە دێـرین و ترسـناکە هێشـتا مـاوە. بەڵام هەرگیز دووبارە نەگەیشتەوە ئاستەکانی پانەپەتا.

# بەشی دووەم
# ئاوڵە

تـــــاکو ئەو کـــــاتەی کە ڕێکخـــــراوی تەندروســـــتی جیهـــانی(WHO) لە ســـاڵی ١٩٨٠، ڕایگەیانـــد کە جیهـــان لە ئـــاوڵە خـــاڵیە، ئـــاوڵە بڵاوەپەتـــا و پانەپەتـــای زۆربەی کـــاتی هەزارەی کۆتـــاییبوو، یـــان کـــۆنتریش. هەروەهـــا بەڵگەکـــانی هەبـــوونی ئـــاوڵە لە مۆمیاکـــانی میســـڕەوە دڵـــبەرن، بەڵام یەکلاکەرنین؛ خۆ لەوانەیە پەتاکەی ئەسینا، کە لە ساڵی ٤٣٠ پێش زاین دەستیپێکرد هەروەهـا مێژوونووس پوسـایدیدێس لە بیرنەکـراوانە باسـیکردووە، لەوانەیە ئـاوڵە بووبێـت، کە سەدان ملیۆن کەسی کوشت. کۆنترین و ڕوونتـرین وەسـفی ئـاوڵە لە ســەدەی_چوارەوە هـاتووە لە لایەن کیمیـاگەری چینـی هـۆ گۆنـگ، کە نووسـیبووی ئەوەی کە پێـی دەوتریـت Chou-hou pei-tsi fag (ڕەچەتەی بـارە لەناکاوەکـان)، ’بە ئەم دواییانە چەند کەسێک هەیە کە تووشی زامـی درمـی

بـوونه له سـەر، ڕووخسـار، کەلوپەلـدان. له مـاوەیەکی کەمیشـدا ئەم زامـانه له هەمـوو لەشـدا بڵاودەبـنەوە، که شێوەی داغی بلۆقی هەیە و هەندێک ماددەی سپی تێدایە. کاتێک هەندێک له ئەو دوومەڵانه وشک دەبن دانەی نوێ له شوێنیان سەر دەردەکەن.*

فراوانترین باسکردنی نەخۆشیەکە، که کاریگەری لەسەر چاودێری پزیشکی هەبووە له سەدەی دەوە هاتووە، کاتێک ڕازی، که پزیشـکێکی فارسـی دانیشـتووی بەغـدادبوو، پەرتووکی A Treatise on the Small-Pox and Measles (زانستنامه لەسەر ئاوڵە و سورێژە) نووسی.

بەڵگەکـان له چـین، هیندسـتان، زۆرێـک له بەشـەکانی ئەفریقیـا ئەوە پیشـاندەدەن که ئـاوڵە بـۆ چەنـدین سـەدە هاوەڵێکی بەردەوامی مرۆڤبووە.

له زۆربەی بـاکووری هیندسـتان، به تـایبەت له سـەدەی هەژدە و نـۆزدە، ئـاوڵە بـوونێکی پیـرۆزی هەبـووە، نەک بوونی وەکو نەخۆشی. سیتالا ژنه خواوەندی ئاوڵەبوو.

هـۆزی چیرۆکـی له ئەمریکـا، به هـاتنی سـاڵانی دەیەی ۱۸۳۰، لەوانەیە پێشـتریش بووبێـت، پەرەیانـدا به سـەمایەک پێـی دەوتـرا ئیتۆهڤنـڤ که ئەنـدازەگی کرابـوو بـۆ هێـورکردنەوەی گیـانێکی شـەڕانگێز که پێـی دوتـرا کۆسڤکڤسـکینی که بـوونی خـۆی له شـێوەی ئـاوڵەدا بەرجەستە دەکرد.

له ئەفریقـای ڕۆژئـاوا، گەلـی یوروبـا و ئەوانـی دیـکەش خواوەنـدی ئاوڵەیـان هەبـوو. له باشـووری ئەفریقیـا، گەلـی خۆسـا دەسـتبەرداری ڕێورەسـمەکانی بەخاکسـپاردن بـوون پاش پەتای گەورەی ئاوڵە له ساڵانی دەیەی ۱۷۷۰. چی دی

ئەوان مردویـان بەخاکنەدەسـپارد؛ بەڵکـو توشـبووان بە بـێ چاودێری لە دارستانەکان دەمردن.

مـردن ئیتـر ئاسـایی نەبـوو، کە بەشـێکی سروشـتی ژیـان بێـت، بەڵکـو ڕووداوێکـی ترسـێنەر و سـامناکبوو. لە یابـان، گەلـی ئـاینو ئاوڵەیـان بە خواوەنـدێک دانـابوو کە سـنووری نێوان شانشینەکانی ئاسمان و زەوی تێپەڕاندووە و خەڵکی بۆ تارمایی دەگۆڕێت کە نەخۆشیەکە لە نێوان زیندووەکاندا بـڵاودەکەنەوە. هـیچ سـەیر نـیە کە نەخۆشـییەک وێرانیەکـی ئاوهای لێ بەرهەم هاتبێت پێگەیەکی بەهێزی داگیرکردبێت لە دەروونی ئەوانەی کە توشبوونە.

بازرگـانی کـویلەی ئەفریقـی و نیشـتەجێ داگیرکەرەکـان ئاوڵەیـان بۆ نێـو جیهـانی نـوێ هێنـا، ئـاوڵە و نەخۆشـیەکانی دیکە دانیشـتوانە ڕەسـەنەکەیان بەڕێـژەیەک کە دەگـاتە ٩٠٪ قڕکرد.

لە سـەرەتاکانی سـەدەی شـازدە بـۆ ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدە، کە ئاوڵە بەردەوام سەرچاوەی خـانەخوێی گونجـاوی دەدۆزیەوە، بـووە هـۆی چەنـدین بڵاوەپەتـای کوشـندە بە درێژای نیوە گۆی زەوی کە گۆڕا بۆ پانەپەتـای ماوە_چەند سەدەیی.

دیـاریکردنی هەبـوونی نەخۆشـیەکان لە نێـو دانیشـتوانە ڕەسـەنەکەی ئەمریکـا ئاڵانگـاریە. چـونکە زۆرێـک لە نەخۆشـیەکان وەکـو یەک دەردەکەون، کە دەخـرێنە ڕوو لەگەڵ نیشـانەکانی وەکـو تـا، شـەکەتی، یـان کـۆکە. بـۆیە لەوانەیە شـایەتحاڵەکان شـێتانە نـاڕوونبن لە وەسـفکردنەکانیاندا. لەگەڵ ئەوەشـدا، بە هـۆی نیشـانە تایبەتەکـانی ئـاوڵەوە، دیارترینیـان دومەڵ کە یەکەم جـار لە

لایەن هـۆ کـۆنگەوە باسـکرا، دەستنیشـانکردنی ئـاوڵە کەمتـر ئاڵۆزە بە بەراورد بە، بۆ نمـوونە جیـاکردنەوەی هەوکردنـی سـی لە سـیل کە بە تەنهـا پشـت بە سەرگوزشـتەکانی سەردەمی_داگیرکاری دەبەستێت. نیشانەکانی ئـاوڵە بۆ زۆر لە چاودێرانی هاوچەرخ ئەوندە ڕوونبوو، هەروەها بە هـاتنی سـەدەی شـازدە و حەڤـدە ئـاوڵە نەخۆشـییەکی بـاوی منداڵانبوو لە زۆربەی وڵاتانی ئەوروپادا_کە بە ناوی تایبەت ناویان دەهێنا نەک بە سادەیی بە پەتا یان دەرد ناوبهێنرێت.

گەلـی مەکسـیکا هـیچ وشـەیەکی نەبـوو بـۆ ناونـانی ئەو نەخۆشـیەی کە پێشـتر هەرگیـز نەیـانبینیبوو، بەڵام وەسـفکردنەکان لە سـاڵی ١٥٢٠ لە دەسـتووری خـۆراکی فلۆرێنسـا ئەوە ئاشـکرادەکات کە ئەو نەخۆشیە ئـاوڵە بـووە کە شـاری تینـۆکتیتلان پـایتەختی ئیمپڕانتـۆریەتی ئەزتەکـی وێرانکرد و ڕێخۆشکەربوو بۆ داگیرکاری ئیسپانی:

(نەخۆشـیەکی گەورە هـاتە نێومـان، دەردێکـی سەرتاسـەری. لە نێوانـدا تەشـەنەیکرد، ژمـارەیەکی زۆر خەڵکـی کوشـت، هەروەهـا لەشـی زۆرێکـی سـەرتاپا بە زام داپۆشـی: لە ڕوخسـار، لە سـەر، سـنگدا، هەمـوو شـوێنەکان. بەڕاستی وێرانکەربـوو. هـیچ کەسـێکی توشـبوو نەیـدەتوانی جـووڵە بە خـۆی بکـات، یـان سـەری بسـوڕێنێت، یـان هـیچ بەشێکی لەشـی خاوبکاتەوە. زامەکـان ئەوەنـدە ترسـناکبوون قوربانیەکـان نەیانـدەتوانی لەسـەر دەم، یـان لەسـەر پشـت ڕابکشـێن، یـان لە لایەکەوە بـۆ لایەکـی دیـکە بسـوڕێن. کـاتێکیش هەوڵیـان بـدایە کە کەمێـک بجـوڵێن، لەتـاو ئـازاردا دەگریـان. زۆر کەس بە نەخۆشـیەکە مـردن، زۆری دیـکەش تەنهـا لە برسـاندا مـردن. ئەوان برسـیبوون تـاکو مەرگ،

چونکە کەس لە ژیاندا نەمابوو تاکو گرنگیان پێبدات. زۆر کەس ڕوخساریان شێوا؛ ڕوخساریان کونج کونج و، چاڵ چاڵبوو بە درێژای ژیان. ئەوانی دیکە بینینیان لە دەستدا، و نابینابوون. خراپترین قۆناغی ئەم درمە بۆ ٦٠ ڕۆژ بەردەوام دەبوو، ٦٠ ڕۆژ لە ترس). بە گشتی هیچ هەڵە تێکەڵکردنێکی ئاوڵە بە نەخۆشیەکی دیکە نیە (هەر چەندە جیاکردنەوەی لە سورێژە دەکرێت ئاستەنگ بێت).

چۆن دەکرێت نەخۆشیەکی وەکو ئاوڵە، کە تاکو کۆتایی سەدەی حەڤدە لە ئەوروپادا بەشێوەیەکی تایبەت توند نەبوو، ئەوەندە کوژەربێت لە دوو کیشوەرە ئەمریکایەکە؟ داگیرکەران لە سەرەتای بەئینگیزکردنی کیشوەرەکە پێیان وابوو کە خودا مەرگ و نەخۆشی هێناوە بۆ هیندەکان، هەم وەکو سزایەک بۆ ژیانی بتپەرستیان هەم وەکو شێوەیەک بۆ پاکردنەوەی زەویەکە.دەیدەنیاری مێژوونووس ویلیام براد‌فۆرد، لە قوڵبوونەوە لە بڵاوەپەتای ئاوڵە لە ساڵی ١٦٣٣، نووسیویەتی، "یەزدان پێیخوشبوو کە سەردانی ئەو هیندانە بە نەخۆشییەکی گەورە بکات." لە ئەنجامدا، "یەزدان بە ئەمە مافی ئێمەی لە ئەم زەویەدا دەرخست." لە ڕۆونەک، لە ڤێرجینیا، تۆماس هاریۆت ڕایگەیاند کە گەلی ئەلگۆنکوینەکان پێیان وابوو "بە تێگەشتنی ئێمە ئەوە کاری یەزدانە، بە ئەمەش ئێمە لە ڕێگەیەوە لەوانەیە بتوانین هەر کەس کە بمانەوێت بیکوژین و لەناوی ببەین بەبێ چەک."

گەلی هۆرون لۆمەی فەرەنسیەکانیان کرد. بە پێی نووسینەکانی مژدەبەخشانی جڤاتی یەسوعی لە پاش گەورە بڵاوەپەتای زەبەلاحی ئاوڵە لە کۆتایی دەیەی ١٦٣٠، هۆرونەکان فەرەنسیەکانیان دادەنا بە "گەورەترین

جادوبازەکـانی زەوی،" چـونکە هەر شـوێنێک کە جڤـاکی یەسـوعیان بـۆی چووبێـت، تێیـدا هۆرونەکـان دەمـردن و مژدەبەخشان دەمانەوە.

مێژووناسـان زۆرجـار لەنـاوچوونی کارەسـاتباری دانیشـتوانیان دەدایەپـاڵ ئەوەی کە بە بڵاوەپەتـای خـاکی پاکیزە ناویان دەبرد. بیرۆکەی بوونی خاکی پاکیزە سادەیە: نەخۆشیەک کە بۆ چەندین ساڵ لە ئەوروپا دەردێکی باوی منداڵانبووە دەبێت بە نەخۆشیەک لە ئاستی دانیشتواندا لە نێو خەڵکانێکدا کە پێشتر بەرکەوتنیـان لەگەڵ نەخۆشـیەکە نەبووە.

بیردۆزەی خـاکی پـاکیزە دەتوانێت بەردەوامـی بـدات بە ئەو بیـرۆکەیەی کە بۆمـاوە و نەژاد کـۆدەبنەوە بـۆ دروستکردنی دانیشـتوانێک لاوازتـر یـان بەهێزتر. بەڵام ئەم بیرۆکەیە ڕاست نیە. هەموو دانیشتوان خـاکی پاکیزەن تـاکو توشی نەخۆشیەکی دیاریکراودەبن. تاعوون گەلـی خۆیسـانی باشووری ئەفریقیای لەناوبرد لە بڵاوەپەتای خاکی پاکیزە لە سـاڵی ١٧١٣؛ لە ئایسـلاند، لە نێـوان سـالانی١٧٠٧ و ١٧٠٩، بڵاوەپەتـایەک نـزیکەی سـێیەکی دانیشـتوانە "پـاکیزەکەی" کوشت.

هەموو ئەوەی بیرۆکەکە پێمان دەڵێت ئەوەیە کاتێک کە نەخۆشـیەکی وەکـو ئـاوڵە دەگـات بە دانیشـتوانێک کە ژمـارەیەکی زۆری خەڵکـی بێ_بەرگـری لەش هەبـووە لە سەرەتادا وەکو، هەموو گەلان لە جیهانی نوێدا؛ خۆیسـان لە سـەرەتای سـەدەی هەژدە؛ هەروەهـا زۆربەی ئایسـلاند، چـونکە چەنـدین دەیە مـاوە هەبـووە لە نێـوان بڵاوەپەتاکان_لەوانەیە ئەنجامی کارەساتباری هەبێت.

خاکی پاکیزە ڕوونکردنەوەیەکی سەرنجڕاکێشە بۆ ئامادەگی توشبوونی هیندە ئەمەریکیەکان بە نەخۆشییەکانی وەکو ئاوڵە. بەڵام پێویستە تەنها بەکاربهێنرێت بۆ ڕوونکردنەوەی ئامادەگی سەرەتایی بۆ ئەو نەخۆشییانەی کە پێشتر ڕوبەڕوو نەبوونەتەوە.

هۆکارەکانی دیکە یارمەتی ڕوونکردنەوەی ڕێڕەوی تێکدەرانەی ئاوڵە دەدەن.

ئەگەری ئەوە هەیە کە هاوچەشنی بۆماوەیی هیندە ئەمەریکیەکان پاش هەزاران ساڵ لە گۆشەگیری هۆکاری هەستیاریان بێت بۆ نەخۆشی. هەروەها دەکرێت، کە زۆرینەی ئاوڵەی جیهانی نوێ ئەفریقی بنەچە و توندتربووبێتن، نەک ئەوروپی بنەچە. بەردەوام هێنانەوەی تاعوون بۆ نێو جیهانی نوێ، لەگەڵ بوونی ماوە لە نێوان بڵاوەپەتاکاندا، ئەوە دەگەیەنێت کە لە زۆر شوێن کاتێک بڵاوەپەتای نوێ دەگەیشت، ڕزگاربووەکان لە بڵاوەپەتاکانی پێشوو دەمردن. زۆرێک لە کۆمەڵەکان ئەوەندە گەورەنەبوون بۆ ئاوڵە تاکو ببێت بە بڵاوەپەتا، بەمەش دەرفەتی ئەوەی نەدەدا بە دانیشتوانەکە بۆ بەدەستهێنانی بەرگری لەش، (هەمان دیاردە یارمەتیدەدات لە ڕوونکردنەوەی کاریگەریە وێرانکاریەکان لەسەر دانیشتوانە لادێنشینەکانی کینیا لە دەیەکانی سەرەتای سەدەی بیست.) تاکو ژمارەی پێویست لە کەسانی بێ_بەرگری لەش لە کۆمەڵگەدا هەبێت، ئاوڵە تەشەنەدەکات. ژنانی دووگیان کە هەرگیز نەخۆش نەببوون نەیاندەتوانی دژەتەنە پارێزەرەکان بۆ کۆرپەلەکانیان تێپەڕێنن؛ دایکانیش کاتێک خۆیان نەخۆش دەبوون نەیاندەتوانی گرنگی بە منداڵە نەخۆشەکان بدەن.

زۆر لە کۆمەڵگە هیندیەکان بە چڕی ئاوەدانبوون، زیاتریش، زۆرجار کۆمەڵی گەورە هاوبەشی هەمان نیشینگەیان دەکرد_کە بارودۆخی نایابە بۆ خێرا بڵاوبوونەوەی ئاوڵە.

بە بێ بوونی هیچ بیرۆکەیەکی درم، و فرە بەسەرکردنەوەی نەخۆشان. هەڵهاتن لە نەخۆشیەکە باوبوو؛ ئاوڵەش هەر بڵاودەبووەوە. ئەو بارودۆخ شێواویەی کە لە زۆری ژمارەی مردووان کەوتەوە زۆر کەسی بەجێهێشت بمرن لە برس و تونێتیدا.لە سالآنی دەیەی ١٦٣٠ ویلیام برادفۆرد لەسەر ڕزگاربووانی بڵاوەپەتای ئاوڵە نووسیبووی "بارودۆخی ئەو خەڵکانە زۆر جێی داخبوو، هەروەها هەموویان ئەوندە خراپ لە ئەم نەخۆشیەدا تێکەوتبوون بە جۆرێک نەیاندەتولنی یارمەتی یەکدی بدەن، نە داگیرساندنی ئاگر و نە هێنانی کەمێک ئاو بۆ خواردنەوە، و نە هیچ بۆ بەخاکسپاردنی مردووان."بڵاوەپەتای ئاوڵە بەرهەمێکی دیکەی کارەساتباری پێشکەوتنەکانی داگیرکاری بوو. ئەگەری سەرهەڵدانی بڵاوەپەتای مەزنی باشووری ڕۆژهەلآتی سالآنی ١٦٩٦-١٧٠٠ دەکرا تەنها بە هۆی تێکدان و جووڵەی بەردەوام بە هۆی بازرگانی کۆیلە ڕەسەنەکان_بازرگانیەک کە بۆ چەندین دەیە کۆمەڵگە ڕەسەنەکانی شێواند لە ڕێگەی هێرش و کۆچکردنەوە.

ئاوڵە دیمەنی نەژادی ئەمریکای ڕەسەنی باکووری لەسەرەتای سالآنی دەیەی ١٦٣٠ دووبارە ڕێکخستەوە و بۆ ماوەی زیاتر لە سەدەیەک ئاوڵە بڵاوبووەوە بە بازرگانی ئەورووپی/ ڕەسەن بۆ پێستەی سەگلاو، چەک و کهول، کە لە دەریاچە مەزنەکان و دەشتەکان و لەوەڕگا سنووریەکان ئەنجامدەدرا.

له سـاڵانی دەیەی ١٦٣٠ و بە هـۆی وێرانکاریەکـانی ئـاوڵەوە، ئایرۆکیەکـان "جەنگـی مـاتەمینی" یـان زیادکرد_دیلکردنی دوژمنیان ڕاگەیاند بۆ قەرەبووکردنەوەی مردووانـی ئـایرۆیی_لە دژی دوژمـنە درێژخایەنەکەیـان، کە هـۆرۆنە. ئـاوڵە ئیرۆکۆیسـەکانی لەنـاوبرد؛ بە نزیکەیـی هۆرۆنیشـی لەنـاوبرد. ئەم لەنـاوچوونەش، هاوشـان لەگەڵ لێوەشاوەیی هێزی سەربازی ئیرۆکی، ڕێگەی بە ئیرۆکی دا وەک هێزی زاڵ دەربکەوێت. هەمان بڵاوەپەتا هۆزی ساوک و هـۆزی فۆکسـی ناچـارکرد بە گەڕان بـۆ پەنـابردن بـۆ ڕۆژئاوای ئەوپەڕتر بۆ نێو گرۆکانی تر، کە هاندەربوو بۆ دروسـتکردنی ناسـنامەی نەتەوەیـی نـوێ. ئـاوڵە بەردەوام دەهـات و دەهـات، دووبـارە و دووبـارە شـێوازی نەژادی ڕێکدەخسـتەوە، ڕێـژەی مردنـی جیـاواز هەنـدێک گـرۆی لاوازکـرد و ئەوانـی تـری بە بەهێـزی هێشـتەوە. گەلـی مۆنسۆنی_قسـەکەر بە زمـانی ئەنیشـینابێ، پیـاوانی دەڵاڵـی بەهێز لە بازرگانی پێستەی سەگڵاو لە سالانی دەیەی ١٦٧٠، بە نـزیکەی لە سـاڵانی دەیەی ١٧٣٠ بە هـۆی ئـاوڵەوە قڕبـوون؛ ڕزگابووەکـانیش بەرەو گرۆکـانی تـر وێڵبـوون، لە کۆتـای سـەدەکە ئەوان وەسـتان لە خۆناسـاندنیان وەکـو ئەوەی کە گەلێکی جیـابن. هەنـدێک خەڵکی وەک ئۆجیبـوای باکوور بەرەو نەمان و تیاچوون هەنگاویان نـا. لەسـەرەتای دەیەی ١٧٨٠، بڵاوەپەتـایەک لە بـاکووری مەکسـیکۆ سـیتی ماڵشدا و بە تەواوەتی گەشتە کەنداوی هەدسن و بـاکووری ڕۆژئاوای زەریای هێمن.

له دەشـتەکانی باشـوور کاتێـک کۆسـتەکە هێوربوویەوە، هۆزی کومانچێ خۆی لە ئاوڵە بە دوورگرت: لە بری ئەوەی

گەشت بکەن بۆ ناوەندە بازرگانیەکان_تەنراو بە ئاوڵە، مانەوە و چاوەڕێی بازرگانان بوون بۆ ئەوەی بێن بۆ لای ئەوان. لەگەڵ چەند هۆکارێکی تر، بە دووربوون لە ئاوڵە ڕێگەی پێدان ببنە بەهێزترین و گەورەترین گەلی هیندی لە ڕۆژئاوای ئەمریکا لە سەدەی هەژدەوە تاکو ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە. لە دەشتەکانی باکوور، بڵاوەپەتاکە بە نزیکەیی گوندەکانی سەر ڕووباری میسۆری ماڵشدا. ژمارەی خەڵکانی هۆزی ئاریکارا بە ڕێژەی لە ٨٠٪ کەمی کرد، ساڵی ١٧٩٥، بازرگانی فەرەنسی ژان باپتیست تروتیو نووسیبووی: "لە کۆندا گەلی ئاریکارا زۆر گەورەبوون، سی و دوو گوندی ئاوەدانی ژمارد، کە ئێستا چوڵبووە بە هۆی ئاوڵەوە و بە تەواوەتی وێرانبووە، هەر چەندە نەخۆشییەکە لە کاتی جیاواز لە نێوانیاندا سەری هەڵداوە، بەڵام تەنها چەند بنەماڵەیەک، لە هەریەک لە گوندەکان دەربازبوون."

هاوسەنگی هێز بەرەو گەلە سوارچاکەکانی دەشتەکان بەرزبووەوە_بە تایبەت سیوکسی ڕۆژئاوا، کە بەهۆی خێرو بەرەکەتی جوگرافیاکەیان لە خراپترین بڵاوەپەتا دەربازیانبوو. تا ساڵی ١٨٠٠ تەواوی ناوچەی (دەشتە مەزنەکە) لە ژێردەستی ڕاوچییە_ئەسپ سوارەکانبوو و گوندەکانی مسیۆری تێکدران.

هەروەک ویلیام کلارک تێبینی کردبوو کاتێک ئەو و میریوتەر لویس لە تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٠٤ سەردانی دەشتەکانیان کرد، "گەلی مانێی چەند ساڵێک لەمەوبەر لە چەند گوندێک لە ناوچەی میسۆری ژێرکەوتەدا دەژیان، ئاوڵە بەشێکی گەورەی نەتەوەکەی لەناوبرد و هەموویان بۆ یەک گوندی گەورە و هەندێک گوندی تری بچوک

کەمکردەوە، هەموو نەتەوەکان پێش ئەم نەخۆشیە لێیان دەترسان، بەڵام ئەوان کاتێک کە ژمارەیان کەمیکرد سیۆکس و هیندەکانی دیکە جەنگیان بەرامبەریان هەڵگیرساند و گەلی مانێی مەزنیان لەناوبرد و میسۆریان سەرخست.

ئاوڵە لە سەدەی نۆزدە لە ئازاردنی هیندەکان بەردەوامبوو. مەندان، هیداتسا، و ئاریکارا لەسەر ڕووباری میسۆری توشی بڵاوەپەتایەکی گەورەبوون لە ساڵی ١٨٣٧-٣٨ کە نزیکبوو کۆتاییان پێبهێنێت؛ هەمان بڵاوەپەتا بەرەو ڕۆژئاوا ڕۆیشت، و هۆزەکانی بلاکپێس، گرۆس، ڤێنتەر، و ئەسینیبۆینی هاوئاست کرد، هاوپەیمانی زێدە بەهێزی هۆزەکانی لاکوتا و چییەن و ئەراپاهۆ؛ هات بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی دەسەڵات. لە کاتێکدا کە بڵاوبوونەوەی خەڵکی ئەمریکا لە نیوەی_سەدەی نۆزدە بەرەو ڕۆژئاوا زیاترو زیاتر فراوان دەبوو، ئەو جیهانە هیندیەی کە بەدیانکردبوو، جیهانێک کە کۆمانچێ و لاکۆتا و ئەراپاهۆ و چییەن زاڵبوون، جیهانێکبوو کە ئاوڵە دروستیکردبوو.

لە سەرەتای ئەوروپای هاوچەرخدا ئاوڵە دوژمنێکی ئاشنابوو، لە زۆر شوێنی ناوچەپەتا هەبوو، و لە هەندێک شوێنی دیکە گەشەی دەکرد بۆ بڵاوەپەتا و پانەپەتا. پێش نیوەی سەدەی حەڤدە، ئاوڵە بە شێوەیەکی تایبەت بکوژێکی توند نەبوو. نەخۆشییەکی کەم_ڕێژەی ناوچەیی بوو، کە زۆر بە دەگمەن لە دەقە پزیشکیەکان یان هەژماری مێژوونووس و گەشتیارەکان نووسرابوو. هیچ بڵاوەپەتایەکی گەورە بوونی نەبوو. لە هەندێک شوێنی وەکو لەندەنی_کۆتایی_سەدەی شازدە، کەم کەس بەهۆی

نەخۆشیەکەوە دەمردن، ئەو کەمینەیەش منداڵبوون. پاشان، بە جۆرێک لە جۆرەکان، ئاوڵە گۆڕا. لە سەدەی هەژدە؛ بوو بە بکوژی سەرەکی کیشوەرەکە، لە خەیاڵی گشتی و ڕێژەی مردندا بەسەر تاعووندا سەرکەوت، لە ساڵی ١٦٤٩، و بە سەرهەڵدانەوەی دووبارە و ڕێکوپێک لە پاشماوەی سەدەکە، بڵاوەپەتای ئاوڵە بەرپرسی زیاتر لە ٨٪ مردنی ساڵانەبوو لە لەندەن. لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدە ئەو ژمارەیە دوو هێندەبوو: لە ساڵی ١٧٦٢ ئاوڵە ٣٥٠٠ کەسی کوشت و بەرپرس بوو لە ١٧٪ مردووانی لەندەن. لە کۆتایی سەدەکەدا ئاوڵە لە نێوان ٨٪ بۆ ٢٠٪ دانیشتوانی لەناوبردبوو.

موتوربەکردنْ، دواتر کوتان، بوونە هۆی گۆڕینی بارودۆخەکە. موتوربەکردن؛ بریتییە تێکردنی بڕێکی کەم لە نەخۆشیەکە بۆ برینێک لە نەخۆشەکە بۆ پەیداکردنی کاردانەوەیەکی ئاست_نزم. ئەگەر هەموو شت باش ڕۆشتبا، نەخۆشەکە جۆرێک ئاوڵەی سوکی دەگرت، بەڵام بە درێژای ژیانی بەرگری پەیدادەکرد، هەروەک چۆن کەسێک کە نەخۆشی گرتبێت و ڕزگاریبووبێت.

موتوربەکردن لە بەشێکی ئەفریقا و هیندستان و چین زۆر پێش ئەوەی لە ناوەڕاستی سەدەی هەژدە لە ئەورووپا باوبێت کرابوو و دەکرا. هەواڵی کاریگەریەکانی لە سەرەتای سەدەکەدا بۆ ئینگلستان و ئەمریکا دزەیدەکرد_لە بۆستۆن، قەشە لۆکە مازەر ڕایگەیاند، یەکێک لە کۆیلەکانی لە ڕۆژئاوای ئەفریقاوە پێی وتووە کە موتوربەکردن لای ئەوان باوبووە؛ هەواڵی موتوربەکردن لە چینەوە گەیشتە ئینگلستان لە ساڵی ١٧٠٠ بە دواوە؛ ئەو قسانەی کە

دەیانوت جوتیارەکانی پۆڵەندا و دانیمارک لە سەدەی حەڤدەدا دەستیانکرد بە موتوربەکردن لە ساڵانی دەیەی ۱۷۲۰ و دەستیکرد بە بڵاوبوونەوە. دوای ئەوەی خاتوو ماری وۆرتلی مونتاگی هاوسەری باڵیۆزی بەریتانیا لە تورکیا، کچەکەی لە ساڵی ۱۷۱۸ لە ئەستەمبوڵ موتوربەکرد، کە ئەو کات ئەو کردەیە زۆر باوبوو؛ لە ساڵی ۱۷۲۱ کوڕەکەی یەکەم کەسبوو لە بەریتانیا کە موتوربەی بۆ کرا. هەر زوو موتوربەکردن خێزانی شاهانەی بە دوادا دێت و موتوربەکردن دەبێتە تایبەتمەندیەکی هاوبەشی کردەی پزیشکی بەریتانی.

لەگەڵ ئەوەشدا دژایەتی هەبوو: نیگەرانی دەربارەی مەترسی توشکردنی خەڵکی بە ئاوڵە، هەروەها نیگەرانی ناوەندە ئاینیەکان لە ئەوەی ئەمە خۆهەڵقورتانە لە چارەنووس. زۆرێک لە نارەزایەتیەکان بە توندی ڕووبەڕووی بەدرۆخستنەوەبوونەوە: موتوربەکردن چەندین ژیانی پاراست بە زۆرکردنی ژمارەی ئەوانەی بەرگریان بۆ نەخۆشیەکە هەیە. تاکو نیوەی سەدەکە، متوربەکردن بە توندی جێگیربوو لە سەرتاپای ئەوروپای ڕۆژئاوا و دوو ئەمریکاکە. چاکسازی لە شێوازی موتوربەکردن، لەگەڵ موتوربەکردنی تەواوی دێهات و شارۆچکەکان لە جیاتی تەنها موتوربەکردنی تاکەکان، کاریگەریەکی پتریان لەسەر تەندروستی گشتی لە نیوەی کۆتای سەدەی هەژدەدا هەبوو.

شارە گەورەکانی وەکو لەندەن بەردەوامبوون لە ئازار چەشتن بە هۆی ئاوڵەوە، چونکە زۆر سەختتربوو کە موتوربە بکرێن بەراورد بە شارەدێیە بچوکەکان.

موتوربەکردن شێوازی تێڕوانینی خەڵکی دەربارەی ئاوڵە گۆڕی: ئاوڵە بوو بە نەخۆشیەک کە ئامرازێکی تایبەت و کاریگەری هەیە بۆ شەڕکردن لەگەڵی. ئەمەش ڕێگەی خۆشکرد بۆ یەکێک لە گرنگترین پێشکەوتنەکان لە مێژووی پزیشکیدا: کوتان.

لە ساڵی ١٧٩٦، کاتێک ئیدوارد جنەر ڕێگری لە ئاوڵە کرد لە مێرمنداڵێکی ئینگلسی بە موتوربەکردنی بە بڕێکی کەم لە خوریکەی مانگا، لە جیاتی ئاوڵەی مرۆڤ بە ڕێگای موتوربەکردنی بلۆق، ئەمەش ئاماژەبوو بۆ سەرەتای کۆتایی ئاوڵە.(وشەی "vaccine" ڤاکسین لە ئیدوارد جنەرەوە هاتووە کە بە خوریکەی مانگای دەوت variolae vaccinae، ڤاریۆلا ڤاکسینا یان ئاوڵەی مانگا.) دوو ساڵ دواتر دۆزینەوەکەی خۆی بە جیهان ڕاگەیاند. لە کاتێکدا ئەوانی تر پێش ئەم بە خوریکەی مانگا موتوربەیان کردبوو، بەڵام داهێنانەکەی جنەر ئەوەی دەسەلماند کە کاریکردووە دوابەدوای توشکردنی نەخۆشێک بە ئاوڵە و پیشاندانی بەرگری لەش.

کوتان بە ئاوڵەی لاوازکراوی مانگا بە خێرایی پەسەندکرا وەک جێگرەوەیەکی باشتری موتوربەکردن: هیچ مەترسیەک بۆ گرتنی ئاوڵە نەبوو، ئەمەش واتە هیچ مەترسیەک نەبوو بۆ بڵاوبوونەوەی. لە ماوەی سێ ساڵی ڕاگەیاندنەکەی جنەردا سەدان هەزار کەس لە ئینگلستان کوترابوون و لە دوو دەیەی دادێ کوتانی ملیۆنانی بە دوادا هات: دوو ملیۆن لە ڕووسیا و نزیک هەمان ژمارەش لە فەرەنسا. تا ساڵی ١٨٠٠ کوتان گەشتبووە ئەمریکای باکوور؛ ساڵێک دواتر گەیشتە بەغداد و لە ئەوێوە بۆ هیندستان چوو.

تاكو ناوەڕاستی سەدەكە، كارەساتەكانی ئاوڵە لە نێو هیندە ئەمریكیەكاندا كەمبووەوە. كوتان بە ئاوڵەی مانگا و پێش ئەوەش موتوربەكردنی بلۆقی ئاوڵەی مرۆڤ یارمەتیدا لە كەمكردنەوەی ژمارەی مردووان. تا ساڵی ١٨٣٠، كۆمپانیای هادسۆن بەی بەشێكی باشی دانیشتوانی ڕەسەنی كانای كوتیبوو؛ لە گواتیمالا پزیشكانی داگیركار لە ساڵانی دەیەی ١٧٧٠ دەستیانكرد بە موتوربەكردنی گەلی مایا، بۆ كاریگەربوونی پرۆسەكە تەنانەت شێوازی پزیشكی گەلی مایایان پەسەندكرد وەك بەكارهێنانی چەقۆی گرانیتی گركانی.

لە ئەمریكا بە گشتی هەوڵی كوتان لە نێو هیندە ئەمریكیەكان زۆر كەم و زۆریش درەنگبوو_بۆیە ئەو بڵاوەپەتا ترسناكە لە ناوچەی میسۆری ڕویدابوو، كاتێك زیاترو زیاتر خەڵكی بەرگری لەشیان پەیداكرد و نەخۆشیەكە بە ژمارەی كەمترو كەمتر دەردەكەوتەوە، ژمارەی مردووان نزمبووەوە.

لە ژاپۆن، كوتان سەرەتا پێشوازییەكی گومانـاوی، تەنانەت نەیارانەشی لێكرا، لە وڵاتێك كە پێشتر "داخراوبوو"، ئەوانەی كە پێكوتەیان هاوردەی ژاپۆن كرد لە پێشڕەوانی كرانەوەی ژاپۆن بوون بە ڕووی ڕۆژئاوا. پێكوتە دەلاقەی سەرەكی نوێگەریبوو، تا ساڵانی دەیەی ١٨٥٠ كوتان پەسەندكرا.

تۆكوگاوا شۆگونات هەوڵیدا هەڵمەتی كوتانی پاڵپشتیكراوی دەوڵەت بەكاربهێنێت بۆ یارمەتیدانی گەلی ئاینو بۆ ئەوەی كەمتر "دواكەوتووبن" و زیاتر پێشكەوتووبن وەكو ژاپۆنیەكان. بەڵام ئەوەی ئایا ئەو پرۆژەیە بە

تەواوەتی سەرکەوتووبووە یاخود نا مشتومڕ هەڵدەگرێت، بەڵام ئەوەی ئاشکرایە ئەوەیە کە باوەڕی لە مێژینەی گەلی ئاینو دەربارەی چارەسەری نەخۆشی ئاوڵە چیتر ناتوانێت بە ڕووی پێکوتەدا خۆی ڕاگیربکات. تەواوی ڕژێمێکی بیروباوەڕی بێچارەکرا لە بەرامبەر ئەم ڕێکارە نوێ و کاریگەرە.

لە ئەوروپا، سەرەڕای هەندێک دژایەتی پێشوەختە لە لایەن ئەوانەی کە کردارەکەیان بە پیس دەزانی یان گومانیان لە بوونی تاکە زیندەوەرێکی هۆکار بۆ نەخۆشیەکە هەبوو کە بتوانرێت بە تاکێکی دیکە ڕابگیردرێت، کوتان هەر بڵاوبووەوە، بە تایبەتی کە لە هەندێک شوێن زۆرەملێبوو. لە سوید لە ساڵی ١٨٠٠ دوازدە هەزار مردنی ئاوڵە هەبوو، لە ساڵی ١٨٢٢ یازدە هەزار هەبوو. دانیشتوانی ئەوروپا هەڵکشا ئەو کاتەی مردن بە ئاوڵە داکشا.

سەرەڕای سەرکەوتنی زووی کوتان، بەڵام پەتای ئاوڵە لە چەندین هەلدا دەتەقیەوە، هەر ئەوەندە کە کوتان ئاوڵەی کەمکردەوە بۆ ئەو ئاستە نزمانە، پەرۆشی سەرەتایی بۆ کوتان نەما، بە هەمان شێوە کاریگەریەکانیشی: هەر چەندە لە سەرەتادا کەس نەیدەزانی، بەڵام کوتان مەرج نییە لەشە بەرگری بە درێژایی ژیان دروستبکات.

لە نێوان ساڵی ١٨٣٦ بۆ ساڵی ١٨٣٩ سی هەزار کەس بە هۆی ئاوڵەوە لە ئینگلستان گیانیان لە دەستدا.

ئەو بڵاوەپەتایەی ساڵانی ١٨٧٠-١٨٧٥ کە بەهۆی شەڕی فرانکۆـڕووسیاوە بڵێسەی سەند، پێنج سەد هەزار کەسی کوشت و بەشێکی زۆری ئەوروپای لە نائاگاییەکەیان ڕاپەڕاند.

ئینگلســـتان و ئەڵمانیـــا یاســـاکانی کوتـــانی زۆرەملێیـــان دەرکـــرد، بەڵام لە ئینگلســـتان، مشـــتومڕ لەســـەر هۆکـــاری نەخۆشـــییەکان_ژینگە، پەڕۆکـــی، هەلاوی بـــۆگەن_ لەگەڵ ناحەزیەکی بەهێز بۆ دەستکاریکردنی لاشەی خەڵکی ئینگلس لە لایەن دەوڵەتەوە و هەســـتێک کە ئـــاوڵە ئەو گـــرنگیەی جـارانی نەمـاوە، بـووە هـۆی دەنـگ هەڵبـڕین و لە هەنـدێک کاتدا دژایەتیکردنی توندوتیژانە بەرامبەر کوتانی زۆرەملێ. لە ئەنجامدا چەندین جۆر لە یاسـاکانی کوتـانی زۆرەملێی لە ساڵی ١٨٨٥ و ساڵی ١٨٩٨ و ١٩٠٧ هەڵوەشێنرانەوە.

سـەرەڕای کەمتەرخەمـی بەرامـبەر کوتـان و دەرکەوتنـی بەردەوام و سەرهەڵدانی لە هەندێک لە ناوچەکان، پانەپەتـای ئەوروپـی سـالانی ١٨٧٠-١٨٧٥ دوایـن دەرکەوتنـی سـەرەکی نەخۆشی ئاوڵەبوو لە کیشوەرەکەدا.

بـوونی کوتـــان، هەروەهـــا جێگـــرتنەوەی وردە وردەی بەکتریـای ڤـارێولای گەورە لە لایەن ڤـارێولای بچـوکەوە_کە کەمتـــــر پەڕۆکە و کەمتـــــر تونـــــدە_واتای ئەوەیە کە لە ناوەڕاســـتی ســـەدەی بیســـتەوە ئـــاوڵە لە ئەوە کەوت کە کێشـــەی ســـەرەکی بێـت لە ئەوروپـا و ئەمریکـا و زۆربەی ولاتانی دیکەی پێشکەوتوو. هەروەهـا لە سـاڵی ١٩٧١ کاتێک کە خزمەتگوزاری تەندروستی گشتی ئەمریکا پێشنیاریکرد واز لە کوتـانی سـالانە بهێنرێـت، هۆکـارەکەی ئەوەبـوو کە سالانە منداڵ زیاتر دەمردن_شەش بۆ هەشت لە ساڵێکدا_بە هۆی ئاڵۆزیەکانی پەیوەندیدار بە پێکوتەوە وەک لە ئەوەی کە بەهۆی نەخۆشی ئاوڵەوە لەناودەچوون.

کوتــان دژی ئــاوڵە، دەســتکەوتێکی نەمــری تەندروســتی گشتیبوو. هەوڵێکبوو کە تەندروستی تاکی دەکردە ئامـانج و کاریگەری قوڵی لەسەر تەندروستی کۆمەڵ هەبوو.

کەمکـــردنەوەی ژمـــارەی ئەو کەســـانەی مەترســـی توشبوونیان هەیە لە دانیشتواندا بە ڕێژەیەک کە بەس نەبێت بــۆ ڕێــگەدان بە بڵاوبــوونەوەی نەخۆشــیەکی درم، کلیلــی جڵەوکردنــی ئەو نەخۆشــیەیە. لە پێشــوودا کە ڕێکارەکــان بەرەو تەندروستی گشتی ئاڕاستەدەکران، وەک بەکارهێنـانی دابڕندن لە کاتی تاعوون، زۆر جیاوازبوون. دابڕانـدن ئامـانج لێــی وەســتاندنی بڵاوبــوونەوەی نەخۆشــیەکەبوو لە کــاتی بڵاوەپەتایەکی دیاریکراو؛ کوتـان ئەگەری ڕوودانـی پەتاکەی هەر لە ســەرەتاوە کەمـدەکردەوە. هەر کە خەڵکـی پێویســت کوتران، ئاوڵە، لە نەبوونی خانەخوێی مرۆیی، هیچ شـوێنێکی نەبوو بۆی بچێت.

ئاوڵە تاکە نەخۆشی درمی مرۆییە کە مرۆڤ ڕیشەکێشی کردبێــت. دوایــین توشــبوون بە ڤــاریۆلای گەورە لە ســاڵی ١٩٧٥ لە بەنگلادیشــبوو؛ دوای دوو ســاڵ ڤــاریۆلای بچــوک دوایین دەرکەوتنی خۆی لە سۆماڵ ئەنجامـدا. کەمێک زیـاتر لە دە ســـــاڵ دوای دەســـــتپێکردنی هەڵمەتـــــی چـــــڕی ڕیشەکێشــکردن لە ســاڵی ١٩٦٧_هەڵمەتێــک کە ڕێکخـراوی تەندروستی جیهانی(WHO) لە سەرەتادا لێی دوودڵبوو، لە جیاتی بڕیـاردان بۆ هەوڵدان بۆ ڕیشەکێشکردنی مەلاریـا و شکســتهێنان_ڕێکخراوی تەندروســتی جیهــانی(WHO) لە ســاڵی ١٩٨٠ خــاڵیبوونی هەســارەکەی لە ئـاوڵە ڕاگەیانـد. بە نزیکەیی بە هەر پێوانەیەک، نرخەکەی؛ ئالانگاری دابینکردن، سیاسی، کۆمەلایەتی و کاریگەریە مرۆییەکانی_ئەو هەڵمەتە

دەستکەوتێکی زۆر گەورەبوو.بە تەنها لە نێو نەخۆشییە گوێزراوەکان، نەخۆشی ئاوڵە هەڵبژاردەیەکی نموونەییبوو بۆ ڕیشەکێشکردن. پێکوتەی بەستووی وشک لە کۆتایی دەیەی سالّی ١٩٤٠ پەرەپێیدرا، ئەمەش واتای سەرکەوتنبوو بەسەر ئاستەنگی بڵاوکردنەوەی پێکوتە لە کەشوهەوای خولگەیی. لیرەکانی سەر ڕووخساری توشبووان ئەوەندە ئاشکرابوون کە هاواریان دەکرد، ئەمەش دەستنیشانکردنی نەخۆشییەکەی ئاسانکردبوو.جیاکردنەوە و چاودێری، شێوازگەلێکبوون کە لە سەرەتای دەیەی سالّی ١٩٧٠ لە لایەنی بەرنامەی ڕیشەکێشکردنی ئاوڵەی(SEP) ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیەوە پێشەنگی دەکران، کە بەکاربوون بۆ ئەوەی بڵاوبوونەوەی ئاوڵە بوەستێنن. هیچ عەمارێکی ئاژەڵیی بۆ نەخۆشیەکە بوونی نەبوو. جیاواز لە مەلاریا کە مێشوولە عەماریبوو. هەروەها ئاوڵە هیچ گوێزەرەوەیەکی نەبوو کە ڕەچاوبکرێت کاتێک بیر لە ڕیشەکێشکردنی دەکرێتەوە، کە ئەمەش پێویستی دەستکاریکردنی بەرفراوانی ژینگەیی لابرد. فشاری ڕیشەکێشکردن پشتگیریەکی گەورەی نێودوڵەتی کۆکردەوە، کە ڕێگەی بە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیدا هەوڵەکانی چڕتربکات. پێش دەستپێکردنی هەڵمەتی نوێ لە سالّی ١٩٦٧، ڕیشەکێشکردن کەم تا زۆر بوونی هەبوو، بەس تەنها بە ناو؛ بیرۆکەیەکی لاوەکی لاواز پاڵپشتیکراوی دارایی نابەس کارمەند بۆ دابینکراوبوو لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی.

بەڵام بۆ چی ڕیشەکێشکردن؟ ئاوڵە هەر لە کاتی ناساندنی پێکوتەکەی جنەرەوە بەردەوام کەم دەبووەوە. لە کاتێکدا لە هەندێک وڵاتدا هەر هەبوو، بەڵام لە زۆر شوێندا

دیارترین کێشەی تەندروستی نەبوو. چرکردنەوەی سەرنج لەسەر خودی ئاوڵە، سەرنجی لەسەر ئەو بارودۆخانە کەمکردەوە کە هەر لە سەرەتاوە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشییەکان. لە ئەو شوێنانەی کە هێشتا ئاوڵە بوونی هەبوو، بەڵام مایەی نیگەرانی نەبوو، وەک لە زۆربەی وڵاتانی ئەمریکای لاتین، ڕیشەکێشکردن بۆ هەندێک وا دەردەکەوت کە سەرقاڵکردنێکی نا پێویست بێت لە کێشەی تەندروستی مەترسیدارتر، هەروەها بارگرانیەکی دارایی زۆر گەورەبوو. ئەمریکا بە تەنها ١ ملیار دۆلاری لە پارەی ئەمڕۆ لە بەرنامەی ڕیشەکێشکردنی ئاوڵەدا خەرجکرد. بەڵام ئەوە ئەو وڵاتانەبوون هەڵمەتەکەیان تێداکرا کە بەشی زۆری تێچووەکەیان لە سەربوو. هێشتا، لە ئەو شوێنانەی کە ئاوڵە بووە هۆی زۆرترین مردن، لە بەشەکانی ئەفریقا و باشووری ئاسیا، نەخۆشییەکە لە ساڵێکدا دوو ملیۆن کەسی لەناودەبرد.

هەر کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) هەڵمەتی چڕوپڕی دەستپێکرد، بەرەوپێشچوون تێیدا خێرابوو. لە ماوەی چەند ساڵێکی کەم ژمارەی ئەو وڵاتانەی کە بڵاوەپەتای ئاوڵەیان هەبوو کەمبوونەوە بۆ چوار_هیندستان، بەنگلادیش، پاکستان و ئیسیوپیا.

ئاوڵە لە هیندستان زۆر لاساربوو، هەر لە ئەوێوە کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) گەورەترین هەڵمەتی دەستپێکرد. تەنانەت لە ئەوێ بەرنامەی ڕیشەکێشکردنی ئاوڵە خێرا ئەنجامدرا، هەر چەند مەرج نیە کە بەرەوپێشچوونێکی نەرم یان بێ ململانێ بووبێت.

ئەو زۆرەملێ و ترساندنەی هەبوو بەهێزکرابوو بە هۆی هاوپەیمانی هەڵمەتەکە لەگەڵ ڕژێمی زۆرداری ئیندیرا گاندی؛ ناکۆکی لە نێوان دەسەڵاتدارانی هیندستان و ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) هەروەها لە نێوان بەرپرسانی ناوخۆیی و حکومەتی هیندستان؛ کێشەی دابینکاری و جۆریەتی پێکوتە_هەموو ئەم شتانە و زیاتر هەڵمەتەکەی لە هیندستان بە تایبەت ئاستەنگ کردبوو. هێشتا، تا ساڵی ١٩٧٥ هیندستان بێ ئاولەبوو.




**٣. منداڵانی هیندستان پشتگیری بەرنامەی ڕیشەکێشکردنی ئاولەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی و حکومەتی هیندستان دەکەن لە ساڵانی دەیەی ١٩٥٠.**

پەسەندکردنی جەماوەری بەرنامەکە بنەڕەتیبوو بۆ سەرکەوتنەکەی.بەرنامەی ڕیشەکێشکردنی ئاوڵە بۆ خۆی سەرکەوتنبوو، بەڵام نابێت وەها یادبکرێتەوە کە لە کاری لە سەرەوە بۆ خواری پلانی لوتکەی جنێفەوە دەرهاتبوو، بەڵکو هەڵمەتەکە خەڵکی ناوخۆیی بێشوماری تێوەگلاند کە بەژداربوونیان لە لایەن هەموانەوە بە پێویست بینراوە؛ کۆبوونەوە بەردەوامە نێودەوڵەتییەکان یارمەتیدەربوون بۆ هاندانی هاوکاری و هاوبەشیکردنی بیرۆکەکان و فێربوون لە ئەو هەزاران ڕێگایانەی کە ئاوڵەی پێ جڵەونەکراوە.

بیرکردنەوە لە هەڵمەتی ئاوڵە کە سەرکەوتوو بووە، تەنها بە هۆی هەوڵی چەند تاکێکی قارەمان کە هێزەکانیان ئاڕاستەکردووە، یان کاری ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) دەبێتە بێوەفایی بەرامبەر هەموو ئەوانەی کە بەژداربوون و وانەیەکی هەڵە لە ڕابردوو پێشکەش دەکات.شاردنەوەی ئەوەی کە هەڵمەتەکە بە ڕاستی چیبوو: هەوڵدانێکی فرە ئاست، نێودەوڵەتی، و ڕەسەن کە وەڵامدەربوو زۆرجار بۆ دۆخی ئاڵۆزی ناوچەیی؛ چیرۆکی سادەکراو سوود بە هیچ کەس ناگەیەنێت.

ئاوڵەی زیندوو ئێستا تەنها لە تاقیگە پارێزراوەکاندا هەیە، کە لە کاتی جەنگی سارد لە لایەن ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەتی جاران دەرکراوە. بەڵام لە حوزەیرانی ساڵی ٢٠١٤ دوو کەموڵە لە بۆماوە ماددەی DNA ئاوڵەی ساغ لە ژوورێکی بەکارنەهاتووی کۆگای پەیمانگای نیشتیمانی تەندروستی دۆزرایەوە، کە بۆ دەیان ساڵ لە ئەوێ لەبیرکرابوو، ئەم دۆزینەوەیە بە کورتی ئەم بکوژە جەرگبڕە، ترسێنەرەی هێنایەوە یادی جیهان.

# بەشی سێیەم

# مەلاریا

مەلاریا لە ئەفریقاوە پەیدابووە. بە هۆی توشبوون بە تاکخانەیەکی مشەخۆر لە ڕەگەزی پلاسمۆدیۆم دروستدەبێت. بە درێژایی مێژوو، چوار جۆر تاکخانەی پلاسمۆدیۆم مرۆڤیان توشکردووە: P. falciparum، P.malariae، P. ovale و P.vivax. لە ئەم دواییانەدا، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، کاتێک مرۆڤ زیاتر و زیاتر دێتە نێو پەیوەندی لەگەڵ زیندەوەرە سەرەتاییەکان بە هۆی پاکتاوکردنی دارستانەکانەوە، جۆرێکی دیکەی پلاسمۆدیۆم P.knowlesi بە شێوەیەکی خێراتر دەبووە هۆی مەلاریا. باوترین جۆرەکانی پلاسمۆدیۆم P.falciparum وP.vivax، P.falciparum کوشندەتر و مەترسیدارترە و بەرپرسیارە لە زۆربەی مردن بە هۆی مەلاریاوە لە جیهاندا.

لەوانەیە مەلاریا لە پێشینە مرۆینەکانماندا پێنج ملیۆن ساڵ پێش ئێستا هەبووبێت، بەڵام بە هۆی ئاڵۆزی سوڕی ژیانی مشەخۆرەکەوە، بۆ ئەوەی بڵاوەپەتایەک ڕووبدات ژمارەیەک ڕەوش پێویستە بێتەدی کە ئەو ژینگەیە دابینبکات کە ژمارەیەکی پێویست لە مێشوولە و خانەخوێی مرۆیی تێیدا بەیەکبگەن. چونکە زۆرجار مشەخۆرەکە خانەخوێیەکەی خۆی دەکوژێت و لە لاشەی مرۆڤدا زۆر نامێنێتەوە بە پێچەوانەی سیل، کە پاش توشبوون دەتوانێت بە درێژایی تەمەن بە ناچالاکی لە لەشی خانەخوێیەکەیدا بمێنێتەوە، بۆیە مەلاریا بەردەوام پێویستی بە دووبارە دابینکردنەوەی خانەخوێ هەیە، ئەمەش پێویستی بە دانیشتوانێکی چڕ هەیە، کە بە هێواشی دەرکەوت کاتێک دەستکرا بە پاککردنەوەی دارستانەکانی ناوەڕاستی ئەفریقا بۆ کشتوکاڵ لە چوار تا دە هەزار ساڵ لەمەوبەردا.

بوونی مێشوولە زۆر پێویستە. مێشوولەش پێویستی بە بارودۆخی ژیانی تایبەت هەیە: ئەوانەش دابینکران کاتێک جوتیارەکان گژوگیایەکەیان بڕیەوە و خۆڵە ئاومژەکەیان پاککردەوە، کە بووە هۆی دروستبوونی گۆمی ئاوی ئامادە بۆ زاوزێکردنی مێشوولە. لەگەڵ بوونی مەڕومالاتێکی کەم وەکو خانەخوێ، جۆرە مێشوولەکانی وەکو Anopheles gambiae پەرەیانسەند بۆ ئەوەی مرۆڤ پەسەندبکەن بۆ ژەمی خوێنمژینیان. بۆ بڵاوبونەوە، ئەو خەڵکانەی کە بە مەلاریا ئەزمووندارن پێویستە تێکەڵی ئەو خەڵکانە ببن کە لە ڕووی بەرگری لەشەوە سادەن.

زانیاری دەربارەی بڵاوبوونەوە زووی مەلاریا لە دەرەوەی ئەفریقا کەمە. بەڵام دوای هەزارەی یەکەمی پێش

زایـین بەڵـگەی پـتەو لە زۆربەی جیهانـدا دەردەکەوێـت کە مەلاریـا دوای کشـتوکاڵ و گۆڕانە ژینگەیـیە دەسـتکردەکانی مرۆڤ کەوتووە.

ناوچەی دەوروبەری ڕۆما مەلاریاوی بوو لە سـەردەمی کۆمـــاری پێشـــوودا کاتێـــک کە بـــارودۆخی ئـــابووری جوتیارەکـانی ناچـارکرد واز لە زەویە کشـتوکاڵیە نزمەکـان بهێنێـت، کە دواتـر ئـاو کۆبـووەوە و گـۆڕدرا بـۆ زەلکـاو و زەویە شـێدارەکانی مەلاریـا. لابردنـی دارسـتان و پاشـماوە خڵـتە و خاشـاکەکانی سیسـتەمی ئـاوەڕۆی بـۆ یەکجـار بەکارهێنـان زیـادکرا بـۆ تـێکەڵەکە. لە ئەو سـەردەمەوە تـا ناوەڕاستی سەدەی بیست باشووری ئیتالیا، ببوو بە قەڵای مەلاریای ئەوروپا.

مەلاریا لە سەرەتای ئەورووپای هاوچەرخدا بڵاوبووەوە، هاوشـــان لەگەڵ پەرەســـەندنی کشـــتوکاڵی. هاوکـــات لە سـەردەمی بازرگانی کۆیلە لە دەریـای ئەتڵەسـیدا لە کۆتـایی سـەدەی پازدەوە تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی نۆزدە بە چڕی و فراوانـی مەلاریـا بڵاوبـوویەوە. لە مـاوەی سـەدەی حەڤـدە و هەژدەدابوو، کاتێک بازرگانی کۆیلە لە لوتکەدابوو، مەلاریا لە ناوچە خولگەییەکانی ئەفریقـاوە ڕێگای خـۆی کـردەوە بۆ نێو ناوچەکانی هێڵی یەکسانی جیهانی نوێ.

بـــۆ مـــانەوەی، مەلاریـــا، وەکـــو ســـیل پێویســـتی بە دەستکاریکردنی ژینەگە هەیە لـە لایەن مـرۆڤەوە. بـارودۆخی شارسـتانی بـووە هـۆی دەرکەوتـی سـیل. ئەو بارودۆخـانەی کە ڕێگایـان بـۆ مەلاریـا خـۆش دەکـرد، بە زۆری لادێـی و کشـــتوکاڵی بـــوون. فراوانبـــوونی ناوەنـــدی شـــارەکان و بەرهەمهێنانی کشـتوکاڵی پەیوەندی بەیەکەوە هەیە: گەشـەی

شارەکان وزەیدا بە گەشە لە کشتوکاڵدا. کەسێک دەتوانێت ئەم چەشنە لە ئینگلستانی سەدەی شازدە و حەڤدە ببینێت، کە تێیدا گەشەسەندنی ژمارەی دانیشتوان و بەشارستانیبوون بەرهەمی کشتوکاڵیان بەهێزکرد.

ئەمە بووە هۆی وشککردنی هەندێک ناوچە و دروستکردنی زەلکاو لە هەندێکی دیکەدا لە ناوچە شێدارەکانی باشووری ڕۆژهەڵاتی ئینگلستان؛ کە بارودۆخی نایابە بۆ مێشوولە و مەلاریا. مەلاریا گەشایەوە کاتێک خانەخوێی مرۆیی دابیندەکرا، بە هۆی هاتنی بە لێشاوی جوتیارە نوێیەکان کە مەترسی توشبوونیان هەبوو.

بەرهەمی کشتوکاڵی هەمووی وەکو یەک نییە. بە گشتی، کە کشتوکاڵی سەرمایەداری بە چڕی وەگەڕخرا لە باکووری جیهان لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و بەشەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا، باشبوونی کشتوکاڵی بەدوادا هات. لە ئینگلستان، ئەمە هەمیشە مانای شێوازی کارامەتربوو لە ئاودێری، هەروەها کۆچی دانیشتوانە دەشتەکیەکان بۆ شارەکان، کە ئەمەش ژمارەی ئەوانەی کەمکردەوە کە مەترسی توشبوون و توانای گواستنەوەی مەلاریایان هەبوو، لە باشووری جیهانی کەم پێشکەوتوودا، پێشکەوتنی کشتوکاڵی بە ئەو فراوانییە نەبوو؛ بارودۆخە مەلاریاویەکە بەردەوامبوو و دانیشتوانە لە ژێر مەترسیدا مایەوە.

پێشکەوتنی کشتوکاڵی و لادێیی بە گشتی بەرپرس بووە لە زۆربوونی مەلاریا، بەڵام خراپی شاردروستی و بوونی ئاوی مەنگ دەتوانێت مەلاریا بکات بە نەخۆشیەکی شارنشین، شتێکە کە زیاتر و زیاتر لە شارە گەورەکانی باشووری جیهانیدا ڕوودەدات. هەروەها ژینگە

دەسـتکردەکانی دیـکەی مـرۆڤ مەلاریـا بەهێزدەکـات. لە نـاوچەی دەرەچەی پاناما لە سـەرەتای سـەدەی بیسـتدا، مێشـوولەی A.albimanus کە زۆرتـرین بەرپرسـیارێتی هەبـوو لە بڵاوبـوونەوەی مەلاریـا لە ئەو بارودۆخـانەدا گەشایەوە کە بە هۆی دروستکردنی دەرەچەکەوە پەیدابببوو.

مێژووناسـێک لە ئەو کـاتەدا ئامـاژەی بە ئەوەدا: 'Anopheles albimanus پەیوەنـدی نزیکـی لەگەڵ مرۆڤـدا هەیە و باشـترین نـاوچەی خـۆی دەدۆزێـتەوە لە دەوروبەری مـاڵ و ئەو بارودۆخـانەی کە مـرۆڤ دروسـتی دەکـات لە چوارچێوەی کـاری کشـتوکاڵی و ئەنـدازیاری، و کـاری تـردا' . جۆسـێف لێپـرێنس و ئەی جەی ئۆرنشـتاین، نووسـەرانی پەرتـووکی ( Mosquito Control in Panama 1916) تێبینـی ئەوەیـان کـرد کە مەلاریـا 'بە خێرایی گەشـەدەکات کاتێک خاکەکە بە هەڵکۆڵینی گەورە و بەرفـراوان تێکـدەدرێت و پڕدەکـرێتەوە و هاوکـات لەگەڵ نیشتەجێکردنی کرێکاری بێ بەرگری لەش لە نزیک شـوێنی کارەکانیان.

ب ەدوای نیشـتەجێبوونی کشـتوکاڵی و هێنـانی کـۆیلە، مەلاریا وێرانەی نایەوە لە چێساپێکەوە تا دۆڵی میسیسپی و ناوچەکـانی دەریـای کـاریبی و ناوچەکـانی ئەولاتـر بـۆ ئەمریکای باشوور.

بەتەواوەتی کەی مەلاریا یەکەم جار گەیشت، نەزانراوە، لەوانەیە پێشـینە ئینگلسـە داگیرکەرەکـان مەلاریـای ( .P vivax)یان بۆ چێساپیک لە باشووری ئینگلستانەوە هێنابێت. تـا ناوەڕاسـتی سـەدەی حەڤـدە کـۆیلە ئەفریقییەکـان P.falciparum هێنـابوو، کە گەشەیسـەند لە نێـو

داگیرکەرانـــی بـــۆ لەشـــە بەرگـــری و خزمەتکـــارە بەکـــرێ گیراوەکانیـــان لە سەرانســـەری ناوچەکـــانی هێڵـــی یەکســـان لە جیهـــانی نوێـــدا. کاتێـــک وا دەرکەوت کە ئەفـــریقیە بە کـــۆیلە گیراوەکـــان کەمتـــر مەترســـی توشـــبوونیان لەســـەرە، شـــوێنی ئەورووپیە بە کرێ گیراوەکانیان گرتەوە وەکو ســـەرچاوەی کارکەر، بازرگانی کۆیلە تەنها کـارکەری نـا ئـازادی هـاوردە نەکـــرد بـــۆ دوو ئەمەریکـــایەکە؛ بەڵکـــو نـــاوچە درمـــیە خولگەییەکانی ئەفریقای هێنا بۆ جیهانی نوێ.

هەروەک چـۆن پێشـتر لەگەڵ تـاعوون دواتـر لە سـەدەی نۆزدە لەگەڵ کۆلێرا، پزیشـکەکانی ناوچەکانی هێڵـی یەکسـان لە ســـەدەی هەژدەدا لە خۆیـــان دەپرســـی ئایـــا نەخۆشـــیەکە بەرهەمی شـوێنەکەبوو یـان گەشـتی کردبوو. زۆرێـک لە ئەو پرسیارانە ئاڵابوون لە نەژاد و کۆیلەیی. پاش تێبینی کردنی جیاوازی ڕێژەی مردن، زۆر کەس لە خۆیان دەپرسـی ئـاخۆ ئەشێت چارەنووسـی ئەوروپیەکـان مـردن بێت بە نەخۆشـیە خولگەییەکـان، لە کاتێکدا کـۆیلە ئەفریقییەکـان بەردەوامـن لە بەرهەڵســـتیکردنی ئەو نەخۆشـــییانە. ئەوە پرســـیارێکی واق ورمێنەربوو. هەروەک دکتۆر ڕۆبێرت کۆلینز لە ساڵی ١٨١١ لەســـــەر مەلاریـــا و تـــای زەرد نووســـــی لە پەرتـــووکی

Practical Rules for the Management of Negro Slaves in the Suger Colonies.

کۆلـۆنیس دەڵـێ، "هۆکاری ئەوەی کە ڕەش پێستەکان لە خراپتـــرین وەرزەکـــان، نـــا تەندروســـترین بارودۆخەکـــان قوتاریان دەبێت، لە کاتێکدا سـپی پێسـتەکان بە ژمـارەیەکی زۆر دەمـــرن، کێشـــەیەکە تـــا ئێســـتا هـــیچ کەســـێک هەوڵـــی

چارەسەرکردنی نەداوە٠ هەندێک مشتومڕی ئەوەیان دەکرد کە ئەوروپیەکان وردە وردە لەگەڵ نەخۆشییەکە ڕادێن.

لە تێزە کلاسیکەکەیدا لەسەر بابەتەکە An Essay on the Diseases Incidental to Europeans in Hot Climates (1786)، جەیمس لیند نووسیویەتی ٠بە تێپەڕبوونی کات پێکهاتەی لەشی ئەوروپییەکان گونجاوبوو بۆ کەشوهەوای ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای هیندی....ئەوروپیەکان، کاتێک بە ئەو شێوەیە ڕادێن، بە گشتی کەمتر بابەتی نەخۆشیبوون لە دەرەوەی ئەوروپا، وەک ئەوانەی لە نیشتیمان مانەوە٠ ئایا ئەمە مانای ئەوەیە کە لەوانەیە ڕەگەزێکی مرۆڤی جیهانی هەبێت، بە یەکسانی توانای گونجانی هەبێت لەگەڵ ئەو کەشوهەوا و نەخۆشیانەی کە لە نێویاندا ژیاون؟ ئایا کەش و هەوا پێکهاتەی زیندەیی دیاریکردووە؟

لە سەدەی هەژدەدا زۆرێک پێیان وابوو وەڵامەکە بەڵێیە.

لە سەدەی نۆزدەوە بیرۆکەکان دەربارەی نەژاد دەستدەکەن بە گۆڕان؛ ئەو بیرۆکەیەی کە کەش و هەوا تەندروستی دیاریدەکات و ئەوەی کە یەکێک خۆی دەگونجێنێت دەستیکرد بە ونبوون. نەژاد بوو بە سنوورێکی جێگیر و توند لە نێوان خەڵکەکان، و گەشبینی ئەوروپیەکان سەبارەت داگیرکردنی ناوچە خولگەییەکان گۆڕدرا بە کۆمەڵە بیرۆکەیەکی ڕەق دەربارەی ناوچە خولگەیی و نەژادە خولگەییەکان. بە ئەم شێوەیە، مەلاریا لە ناوچە خولگەییەکان بەژداربوو لە بە ڕەگەزپەرستی کردنی پزیشکی.

دوای یەکەمین دەرکەوتنی لە ناوچەکانی هێڵی یەکسان لە سەدەی حەڤدە، مەلاریا لە ڕێگەی هێزە جیاجیاکانی کۆچی مرۆڤەوە بۆ نێو وڵات پاڵی پێوەنرا. لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، سنووری کشتوکاڵی و مەلاریا بەرەو ڕۆژئاوا بۆ نێو ئۆهایۆ و دۆڵی میسیسپی ڕۆیشتن. لە بەرازیل، کانسازی زێڕ کارکەر و مەلاریای ڕاکێشا بۆ ناو زەویە دوورەدەستەکان، کە هەر زوو پاککردنەوەیەکی گەورەی دارستانەکانی بەدوادا هات بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ کێڵگە گەورەکانی پێویست بۆ پێدانی خواردن بە کارکەری نوێ خۆشبکات، زیاتر لە یەک ملیۆن کۆیلەی ئەفریقی هاتنە نێو وڵات لە ماوەی ئەوەی کە پێی دەگوترا سەدەی کانزایی لە سەدەی ١٧٠٠. ئەم ژینگە نوێیە ژینگەیەکی نایابی بۆ یەکێک لە باشترین و کاراترین هەڵگرەکانی مەلاریا ( P. falciparum) دروستکرد، دانیشتوانە جیگیربووەکەی کانەکان خانەخوێیەکی نایابیان دابین دەکرد. مەلاریا تەقییەوە، بەڵام لەکاتێکدا مەلاریا وەک کێشەیەک مایەوە بۆ سەدەی بیست لە باشووری ئەمریکا، ئەو شێوازەی لە شوێنەکانی وەک ئینگلستان دامەزرابوو خۆی دووبارە کردەوە: پێشکەوتنەکانی بواری کشتوکاڵ، بەرەو کەمکردنەوەی بارگرانی مەلاریا دەڕۆی، شان بە شانی کەمبوونەوەی بەرکەوتن بە مەلاریا، چونکە ئەم پێشکەوتنانە خانوو و خۆراکی باشتریان لەگەڵ خۆیان هێنا. بەڵام لە ناوچە کەمەرەییەکان، مەلاریا خراپتربوو و بوو بە بەشێکی "سروشتی" لە ناوچەکە.

لە زۆربەی سەدەی نۆزدە، مەلاریا لەگەڵ کۆلێرا دوو نەخۆشی بنەڕەتی هەڵاوی بۆگەنبوون، کە سەرچاوەیان

گرتبوو لە ئەو گازانەی کە لە پاشماوەی ڕزیوی سەوزە و ئاژەڵەوە دەردەچن، باران یان تێکدانەکانی دیکەی خاک وەکو کشتوکاڵ یان پێشکەوتنی شارستانی دەتوانێت بەشداریبکات لە دەرکەوتنی ئەم دەرهاویشتە گازیانە. تەنانەت خودی وشەی مەلاریا واتا هەوای خراپ.

بیردۆزی میکرۆب ئەوەی گۆڕی. دوای ئەوەی ئالفۆنس لاڤەران لە ساڵی ١٨٨٠ مشەخۆری مەلاریای لە خوێنی مرۆڤدا دۆزیەوە و بەردەوامبوونی پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیای نەخۆشیناسی ڕێگەی بە خەڵکێکی زیاتر و زیاتردا ببینن، و بە ئەم شێوەیە قبوڵی بکەن. ئەوەی کە مەلاریا بە هۆی تاکخانەیەکەوە بووە، بیردۆزی هەڵاوی بۆگەن چیتر زاڵنەبوو. دواتر بیردۆزی گوێزەرەوە هات، نزیک کۆتایی سەدەکە، لە ساڵی ١٨٩٨ ڕۆناڵد ڕۆس لە هیندستان و گیوڤانی گراسی لە ئیتالیا سەلماندیان کە مێشوولەی ئەنۆفلین مەلاریای بڵاوکردۆتەوە.

مەلاریا گۆڕا، وەکو کۆلێرا و سیل لە پێشی و تاعوون بە ماوەیەکی کەم لە پاشی، لە نەخۆشیەک کە بە زۆر شت لێکدانەوەی بۆ دەکرا بۆ نەخۆشییەک کە بە یەک شت لێکدەدرایەوە؛ پێوەدانی مێشوولەیەکی تووشبوو.

ئەنجام: جڵەوکردنی هەڵگر و مشەخۆر، لە جیاتی هێورکردنەوەی ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتی یان ئابووریانەی کە بوونە هۆی دەرکەوتنی مەلاریا، زاڵبوو.

جڵەوکردنی هەڵگر کاریکرد لە ئەو شوێنانەی کە مێشوولەکان بە بێوچان هێرشیان کرایە سەر بە سەرچاوەی پێویست یان ئەو شوێنانەی کە کێشەی مەلاریا تێیاندا سنووردداربوو.

له ناوچەی دەرەچەی پاناما لە سەرەتای سەدەی بیست، ولیام گۆرگاسی عەقیدی لێپرسراوی هەوڵی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ تەندروستکردنی ناوچەکە، بە پەرۆشیەکی بێوێنەوە هێرشیکردە سەر مەلاریا و نەخۆشی تای زەرد بە تەرخانکردنی خۆی بۆ تێگەیشتن لە خووی زاوزێ و ناوچەکانی مێشوولەکان و پاشان لەناوبردنیان. لەگەڵ سەرچاوە فراوانەکانی ئەمریکا هەموو ئەوە دەتوانرا ئەنجامبدرێت. لە ماوەی دوو ساڵدا نەخۆشی تای زەرد بوونی نەما. مەلاریا زیاتری خایاند، ئەنباری توشبوونەکە گەورەتربوو، چونکە دووبارە توشبوونەوە بە مەلاریا ئەگەری هەبوو (چاکبوونەوە لە تای زەرد، بە پێچەوانەوە، بە درێژای ژیان بەرگریێ لەش دەبەخشی). بەڵام مەلاریا لە کۆتایدا خۆی بەدەستەوەدا، سەرکەوتنی گۆرگاس لە پاناما سەرکەوتنی تەندروستی گشتیبوو کە ستایشکرا وەکو هەنگاوێکی بنچینەیی بۆ جێگیربوونی شارستانی لە ناوچە خولگەییەکان. لە وتاری 'The Conquest of the Tropics for the White Race' کە لە ساڵی ١٩٠٩ لە گۆڤاری کۆمەڵەی پزیشکی ئەمریکی بڵاوکرایەوە، گۆرگاس ئەو کارەی کە خۆی و ئەوانی دیکە لە پەنەما ئەنجامیاندا دادەنا بە "سەرەتایترین پیشاندان کە مرۆڤی سپی دەتوانێت لە ناوچە خولگەییەکان بگەشێتەوە، وەکو خاڵی دەستپێکی کاریگەر لە داگیرکردنی کاریگەری ئەم هەرێمانە لە لایەن قەوقازیاکانەوە" گەشبینیەکی بە ئەم شێوەیە ئەو باوەڕەی سەرەوخوار کرد کە بە درێژایی زۆربەی سەدەی نۆزدە زاڵبوو کە ناوچە خولگەییەکان بۆ نەژادی سپی نەگونجاوبوون.

دۆزینەوەکـــان کە بـــوونە هـــۆی ئەگەری جڵەوکردنـــی مەلاریـا و بـوارێکی نـوێی لە پرسـی پزیشـکیدا بەهێزکـرد؛ پزیشـــکی خـــولگەیی، کە تەرخـــانکرابوو بـــۆ تێگەیشـــتن لە مشـەخۆران و هەڵگرەکانیـان. مەلاریـا پێشـڕەویی بـوارەکەی دەکرد. بەگوێرەی دامەزرێنەری پزیشکی خولگەیی، پاتریک مانســـــۆن، ئەوە "کـــــۆلێرا تـــــا ئەوپەڕی گرنگتـــــرین نەخۆشیبوو... لە نەخۆشیە خولگەییەکان،" چونکە "هۆکـاری سەرەکی نەخۆشی و مردن بوو لە ناوچە خولگەیی و ناوچە نیمچە خولگەییەکان" ئەم بـوارە نوێیەش بەرنامەی ڕاهێنـان، گۆڤـار و کارنـامەی تـوێژینەوەی لـێکەوتەوە. قوتابخانەکـانی پزیشـــکی خولگەیی_قوتابخـــانەی لیڤەرپـــوڵ بـــۆ پزیشـــکی خـــــولگەیی یەکەمبـــــوو، لە ســـــاڵی ١٨٩٧ کـــــرایەوە_لە سەرتاسەری ئەوروپا و ئەمریکا دامەزران.

تێکەڵێکــی بەهێـــز لە گەشـــبینی و لەخۆبـــاییبوون کە بە پێشـــــکەوتنی زۆر ڕاســـــتەقینە لە جڵەوکردنـــی مەلاریـــا هێنرابوون و ئەو هەستە گەشەکردووەی کە دەکرێت شەڕی نەخۆشـیەکان لە ڕێـگەی پزیشـکی هـاوچەرخەوە بکرێـت، بـوونە هـۆی دروسـتبوونی پزیشـکی خـولگەیی. جڵەوکردنـی مەلاریا پێویستبوو، چونکە لە زۆر شوێن نەخۆشییەکە تەنیا بەرەو خراپتـر دەچـوو کە بڵاوەپەتاکـان بەردەوامبـوون لە پاشینەی پێشکەوتنی ناتەریب لە ناوچەکاندا.

مەلاریـا کەمبـووەوە لە ئـەو شـوێنانەی کـە چاکســازی کشـــتوکاڵی ژینگـــەی مێشـــوولە کەم کـــردەوە هەروەهـــا باشـــتربوونی شـــێوازی ژیـــان واتـــا بەرکەوتنـــی بە مەلاریـــا کەمتربوو. بەڵام لە زۆر بەشـی جیهـان جوتیارەکـان هەلێکی

کەمیان بۆ ڕەخساوە، و دەرەخسێت بۆ دەربازبوون لە مەلاریا و چەندین هەلیان بۆ توشبوون هەیە.

کشتوکاڵی کەم سەرمایەدار، و پشت بەستوو بە جوتیار زۆر خەڵکی بە هەژاری و بەردەوام لە ژێر مەترسی توشبووندا هێشتەوە.

کشتوکاڵی کێڵگەی بەرفراوان، کە تیشکی خستبووە سەر یەک دانەوێڵە و هەژارانی لادێنشینی بەکاردەهێنا، کە زۆرجار باروودۆخی بڵاوبوونەوەی مەلاریایان دروستکردبوو: لەناوبردنی دارستانەکان بۆ کێڵگەکان زەوییەکی نایابی بۆ زاوزێی مێشوولەکان دروستکردبوو.

جا کە کێڵگە بەرفراوانەکان داوای هێزی کاری زۆریان دەکرد و کارکەر هەمیشە بەردەست نەبوو لە ناوخۆدا، بۆیە بازاڕێک لە کارکەری کۆچکردووی لادێیی دەرکەوت. هەروەک کۆچکردنی کارکەری زۆرەملێی بازرگانی کۆیلەی ئەتڵەسی مەلاریای هێنا بۆ ناوچەکانی هێڵی یەکسانی جیهانی نوێ، کۆچی کارکەر لە بەشەکانی ئەفریقا، ئەمریکای باشوور، هەروەها ئاسیا لە سەدەکانی نۆزدە و بیست نەخۆشیەکەیان هێنا بۆ ئەو ناوچانەی کە ڕۆژانێک بێ مەلاریابوون کاتێک کارکەرە دامەزراوەکانی ئەو ناوچانەی کە مەلاریایان تێدا نەبوو گەڕانەوە بۆ ماڵەوە و نەخۆشیان لەگەڵ خۆیان هێنابوو.

بە پێی سی. ئەی. ئەی بێنتلی و س. کریستۆفەرس لە پەرتووکەکەیان Causes of Blackwater Fever in the Duars لە ساڵی ۱۹۰۸ ئەوە (کرانەوەکەی ناوچەکانی هێڵی یەکسان) بۆ کشتوکاڵی بەرفراوان، پاڵپشتیکراو بە ئاودێری بوو، کە مەلاریای کرد بە بڵاوەپەتا لە هیندستان لە

سەرەتای ساڵانی دەیەی ١٨٦٠. کە خاکەکە بە خراپی ئاوەڕۆ دەکرا، جۆگەکانی ئاودێری بوون بە گۆمی مەنگی نایاب بۆ زاوزێی مەلاریا؛ گێڵگەی چای گەورە هێزێکی کاری کۆچبەری زۆری ڕاکێشا. ئەوە باشترین سیناریۆبوو بۆ بڵاوبوونەوە پەتای مەلاریا.

کۆچی کرێکاران لە چەندین جار و لە زۆر شوێندا بەرپرسیاربووە لە پەتای مەلاریا. بۆ نموونە، هەراسانبوون بەهۆی وشکەساڵی و هەژاری بەهۆی هاوبەشیکردنی کشتوکاڵ، جوتیارەکانی ناوچەی سێرتۆی نیمچە وشکی بەرازیل، کە زۆربەیان بێ مەلاریابوون، بۆ کارکردن ڕوویان لە کەنارەئاوەکان و ئەمازۆن کرد. لە ئەوێ توشی مەلاریابوون، هێنایانەوە بۆماڵەوە، چەغماغەی بەرپابوونی نەخۆشیەکەیان لێدا. وشکەساڵیەکی درێژ لە ساڵی ١٩٣٦ دەستپێکرد، ژمارەیەکی زۆرتر و زۆرتری پیاوانی ناچارکرد بۆ ڕاکردن بە دوای دۆزینەوەی کار.

لە کەنار ئاوەکان ڕووبەڕووی ڕەگەزێکی کوشندەی مەلاریا بوونەوە کە بە ئەم دواییانە بەهۆی مێشوولەی ئەی. گامبیا، کە بە ڕێکەوت بە کەشتی لە ڕۆژئاوای ئەفریقاوە هاوردە کرابوو. ئەوانەی لە پەتای کەناردەریا ڕزگاریانبوو گەڕانەوە بۆ سێرتۆ، شانبەشانی کۆچبەرانی ئەمازۆن لەگەڵ مەلاریای زیاتر، کە چەغماغەی پەتایەکی گەورەی مەلاریایان لێدا. ژمارەی مردووان زۆر گەورە بوو: بە فەرمی پێنج هەزار، بەڵام بەدڵنیاییەوە زیاتربوو.

ڕۆژنامەیەک باسی لە ئەوە کردووبوو کە "زمانی مرۆڤ زۆر لە ئەوە دوورترە و کەمترە کە بەسبێت بۆ وەسفکردنی ئەو وێرانەیەی لە هەرێمەکەدا هەبوو.... باوەڕی گشتی ئەوە

بوو کە باکووری ڕۆژهەڵات بێ دانیشتوان دەبێت، چونکە ئەوانەی بە یەکەمجار نەمردن ناوچەکەیان جێهێشت.

هاتنی مێشولەی ئەی.گامبیا لەگەڵ دانیشتوانە بێ لەشەبەرگریەکە کە بە هۆی باری کۆمەڵایەتی و ئابوورییەوە ناچار بە کۆچکردن کرابوون، بوونە هۆی پەتاکە. لە ساڵەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ دا، بە هەمان شێوەیە کۆچی زۆرەملێی خەڵکی ڕەشپێستی ئەفریقیای باشوور لە پەرێزە بەرزە بێ مەلاریاوە بۆ ناو پەرێزی نزمی مەلاریاوی، کۆمەڵەیەکی نوێی مەلاریایان دروستکرد. کاتێکیش کۆچیان کرد بۆ کوێستانەکان بۆ کارکردن لەسەر کێڵگەکان کە لە لایەن ئەو خەڵکەی کە ئاوارەیان کردوون شوێنیان گیرابووەوە، مەلاریایان لەگەڵ خۆیان هێنا. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی بارودۆخی هاوشێوەدا کە هیچ نیشانەیەکی وەستانی بە سەر زۆربەی جیهانی خولگەیی پیشان نەدەدا، چارەسەرێک پێویستبوو.

ئەوانەی دەیانخواست مەلاریا جڵەوبکەن، بەسەر دوو گرۆدا دابەشبوون کە دوو ڕێگەچارەی جیاوازیان پەسەند دەکرد: کوشتنی هەڵگری مێشوولە یان مامەڵەکردن لەگەڵ تووشبوون لە مشەخۆری پلاسمۆدیۆم. سەرکەوتنی گۆرگاس لە پاناما و کوبا جڵەوکردنی هەڵگری بەهێزکرد، لە کاتێکدا جڵەوکردنی مشەخۆرەکە بە هۆی دۆزینەوەی دەرمانی کوینینی پارێزەرەوە گونجاوبوو. هەر یەکێکیان باشە و لاوازیی خۆی هەبوو. بەهای سنووورداری کوینین وەک ڕێکارێکی پارێزەر تا ڕادەیەک بە هۆی سوودە چارەسەرییەکانیەوە قەرەبوو کرابووەوە. دەرمانی کوینین کاریدەکرد لە ڕێگەی گرنگیدان بە نیشانەکانی نەخۆشیەکە،

بەڵام دابینکارییەکان لەوانەیە نارێکخراو و تێچوو زۆربێت لە ئاستی بەرفراواندا؛ تامە ناخۆشەکەی هاندەری بەکارنەهێنانبوو، هەروەها، گواستنەوەی نەخۆشیەکەی نە دەوەستان. واتا، کەسێک دەکرێت تووشی پلاسمۆدیۆم بێت، نیشانەکانی بە کوینین وەستابێت، بەڵام هێشتا دەتوانێت نەخۆشییەکە بڵاوبکاتەوە. جڵەوکردنی مێشوولەی هەڵگر سەرکەوت، بەڵام گران بەها و لە بواری دابینکارییەوە ئاڵۆزبوو.

داوای چەندین سەرچاوەی دەکرد کە زۆر لە شوێنەکان کە ناتوانن دابینی بکەن. هیچیان نەیاندا لە هۆکاری شاراوەی بەردەوامبوونی مەلاریا.

دوای سەرکەوتنی سەرسوڕهێنەر لە چەندین شوێن، جڵەوکردنی هەڵگر زاڵبوو، لەوانەیە گۆرگاس پێشەنگ بووبێت، بەڵام نموونەی دیکەی سەرکەوتوو بۆ جڵەوکردنی کەسی هەڵگر هەبوو، وەک ئەو شێوەیەی کە بە پاکژکردنی ڕەگەزەکان ناسراوبوو، کە زەویەکانی زاووکردنی ئەنۆفیلی دیاریکراویان کردۆتە ئامانج ل ەلایەن مالکۆلم واتسۆنەوە لە مالیا پێشەنگبوو و دواتر لە؛لایەن ئێن ئار سوێلنجێربێل لە ئەندەنووسیا لە ماوەی چەند ساڵانی پێش جەنگی جیهانی یەکەم.

ئەم شێوازەی جڵەوکردنی هەڵگر زۆر کاریگەربوو لە ئیتالیا لە ماوەی ساڵەکانی ١٩٢٠ و ١٩٣٠ دا ڕژێمی فاشی مۆسۆلینی بە وشککردنی زۆنگاوەکانی پۆنتین و چاککردنی ناوچەکە بۆ کشتوکاڵ و دووبارە نیشتەجێکردنەوەی ناوچەکە، دەستی مەلاریایان لاوازکرد. لە فەلەستین بەرنامەیەکی کەمتری چاکسازی کشتوکاڵی و جڵەوکردنی

توشبوو یان هەڵگر مەلاریای هێنایە سەر چۆک. هەروەها لە کاتی داڕوخانی مەزن لە ئەمریکا، دەسەڵاتدارانی دۆڵی تێنیسی دەستیاندایە بەرنامەی باشتربوونی لادێی کە ڕزگاربوونی هەرێمەکەی لە مەلاریا لەخۆدەگرت. نزمکردنەوەی ئاستی ئاوی گلدەری بەنداوی دروستکراو بۆ دامرکانەوەی هێلکەکانی مێشوولەی ئەی کوادراکولاتۆس، پەرەپێدانی دەرگا و پەنجەرەکانی (کردەیەک لە سەدەی نۆزدەوە تا ئێستا زیاتر و بەربلاوتر دەبێت) و بەکارهێنانی کرم کوژەکان بۆ بەهاناوەچوونی ناوچەکان، و دروستکردنی ناوچەی لەوەڕاندنی ئاژەڵ بە درێژایی کەنار دەریاکان بۆ دابینکردنی مێشوولە خانەخوێیەکی جێگرەوەی هەموو ئەمانە دابەزینێکی بەردەوامی مەلاریای مسۆگەرکرد لە باشووری ویلایەتە یەکگرتووەکان.

پێگەی جڵەوکردنی هەڵگر لە لوتکەی هەوڵەکانی کەمکردنەوەی مەلاریابوو کە پتەوکرابوو لە ساڵانی دەوروبەر و نیوەی جەنگی جیهانی دووەم.

پێشکەوتنی گەورە لە تێگەشتنی پەتاناسی دەربارەی مێشوولەی ئەنۆفلاین، بە تایبەت زانیاری زیاتر دەربارەی ئەوەی کە چ جۆرە نەخۆشیەک هەڵدەگرێت و چ جۆرێک هەڵناگرێت؛ سەرکەوتنی فرێد سۆپەر و دامەزراوەی ڕۆکفێلەر لە ڕیشەکێشکردنی مێشوولەی ئەنۆفلاین گامبیا لە بەڕازیل؛ دۆزینەوەی مێروکوژی DDT لە سەردەمی جەنگدا؛ هەمان ئەو دنەی پاش جەنگەی کە هەڵمەتی جڵەوکردنی سیلی بڵاوکردەوە بە هەموو جیهاندا، هەموو پێکەوە کۆبوونەوە بۆ ئەوەی هەڵمەتی جڵەوکردنی مێشوولە نەخۆشی هەڵگرەکان سەرکەوتووبێت.

مەلاریا چووە پاڵ سیل و ئاوڵە وەک ئامانجێک بۆ بەرنامەی پاش جەنگ لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO).

جڵەوکردنی مەلاریا بە ئامانجی بەهێزکردنی دیموکراسی و سەرمایەداری و وەستاندنی تەوژمی کۆمۆنیزم.

بەڕێوەبەرایەتی گەشەپێدانی نێودەوڵەتی ویلایەتە یەککگرتووەکان لە ساڵی ١٩٥٦ ڕایگەیاند کە جڵەوکردنی مەلاریا قەربالغی شاری جاڤای کەمردەوە و ناوچەکانی ژێر دەسەلاتی ڕژێمی ڤێت مین بۆ تیپەکانی ڕژێنەری مێروکوژی DDT دەکردەوە، و ڕزگارکردنی گوندەکانی فلیپین لە مەلاریا واتای ئەوە بوو کە جوتیارە بێ زەوییەکانی پێشتر ئێستا دەتوانن ببنە جوتیاری سەرکەوتوو لەسەر زەویە تازە چاککراوەکان؛ ئەمەش واتای ئەوەیە ئەوان لە بوون بە تیرۆرستی هۆک بە دووربن.

جڵەوکردنی مەلاریا واتای جڵەوکردنی کۆمۆنیزم و بلاوبوونەوەی دیموکراسیبوو_بیرۆکەی "مەلاریا پێشکەوتن ڕادەگرێت" ئەمە واتای جیاوازیبوو لە بوون بە هاوچەرخ و گەشەکردنی ئابووری یان هەژاربوون، چەقین لە نەریتدا_باوبوو.

پاوڵ ڕۆسێل پسپۆڕی مەلاریا بە کورتی داینا: مەلاریا یارمەتیدا "بۆ ئەوەی کۆمەڵگە تووشببێت بە میکرۆبی سیاسی کە دەتوانێت ئازادی پەکبخات و لەناویببات."

پزیشکی زیندەیی بۆ هەندێک، وەکو والش ماکدێرمۆت شارەزای ئەمریکی سیل، کلیلی پێشکەوتنی جیهانی هاوچەرخبوو.

"ئامانجی پزیشکی زیندەیی لە گەشەی نێودەوڵەتی، یان هاوچەرخکردنی ئامانجدار، گۆڕینی شێوازی نەخۆشیە لە کۆمەڵگەیەکی فرە نەریت بۆ شێوەیەک لە نەخۆشی کە وەکو بەربەستێکی سەرەکی کارنەکات لە بەرامبەر هەوڵەکانی نوێگەری."

بۆیە گەشبینی لە دەورەی جڵەوکردنی مەلاریا کۆبووەوە کاتێک ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) بڕیاریدا بە ڕیشەکێشکردن.

مەلاریا بوو بە نموونەی بنەڕەتی نەخۆشی خولگەیی، هەروەها بوو بە ئەو نەخۆشیەی کە پێناسەی ئەو سەردەمە پڕ لە شانازی و گەشبینیەی دەکرد. بە هۆی ئەو پێشکەوتە زۆرانەی زیندەزانی بە تایبەت دژەزیندەییەکان و مێروکوژی DDT، وا دەردەکەوت کاتی ئەوە هاتبێت کە بیر لە ڕزگارکردنی جیهان لە هەندێک نەخۆشی بکرێتەوە. ئەمە ئەو کەشە بوو کە تێیدا شارەزای نەخۆشیە درمیەکان تی ئایدن کۆکبێرن لە گۆڤاری لە گۆڤاری Sience لە ساڵی ١٩٦١ بانگەشەیکرد کە گوتی:

"دەتوانین بە متمانەوە بڕوانین بۆ ئاستێکی بەرچاو لە ئازادی لە نەخۆشیە درمییەکاندا، لە کاتێک کە زۆر دوور نییە لە داهاتوودا."

مەلاریا بوو بە بەربژێرێکی سروشتی بۆ ڕیشەکێشکردن. زانینی زیاترو زیاتر دەربارەی هەردوو شێوازی زاوزێی مێشوولە و ئەو جۆرانەی کە مەلاریا دەگوازنەوە، بوونی نموونەی هێزی ڕیشەکێشکردن لە بەڕازیل، هەروەها پڕچەکبوون بە هۆکارێک کە ئەندازەکرابوو بۆ مێشوولەکان، هەموو ئەمانە کۆبوونەوە لە ئەو تەوژمە بەهێزەی پاش

جەنگ بۆ نێو جیهانی تازە پێشکەوتوو، و زیادکردن دەستدرێژییەکی بێوێنە بۆ سەر مەلاریا.

هەروەها ئەوە گرنگبوو لە ساڵی ١٩٥٥، کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) بە فەرمی بەرنامەی ڕیشەکێشکردنی مەلاریا(MEP) ڕاگەیاند. بەڵام ڕژێمی بەڕێوەبەرایەتی تەندروستی جیهانی زۆر لە ئەوە بچوکتربوو کە ئەمڕۆ هەیە؛ ژمارەی شارەزایان بە نزیکەیی کەمبوو، زۆربەیان هاوبیربوون، کە زۆربەیان ئەندامی لیژنەی شارەزایانی بواری مەلاریابوون لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO). گرۆیەکی زۆر بچوک بڕیاریاندا مەلاریا بنبڕبکەن لە ڕیگەی پرژاندنی جێماوەی نێومالّی مێروکوژی DDT.

لایەنە سەرەکیەکان بریتیبوون لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(who) و حکومەتە بەخشەرەکانی وەکو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا؛ هەروەها ڕێکخراوەکانی وەکو یونیسێف ڕۆڵی گرنگی پشتگیریان هەبوو. سەرچاوەی دارایی بە زۆری لە لایەن ئەمریکا و بریکاری نەتەوە یەکگرتووەکانی وەکو یونسێف دابیندەکرا؛ هەروەها حکومەتە ناوخۆییەکان ئەوەی کە ماوەتەوە لە ئەستۆیان دەگرت. زۆر جار بەفیڕۆدانێکی گەورەبوو بۆ دەستکەوتێک کە زۆر جار کەمبوو.

ئەو متمانەیەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(who) بە بەرنامەی(MEP) هەیبوو، دەرکەوت، کە لە جێگەی خۆی نەبووە. لە ماوەی چواردە ساڵەی تەمەنی (MEP)، مەلاریا زۆر ئاستەنگترە بۆ ڕیشەکێشکردن لە کردەدا وەکو ئەوەی کە لە بیردۆزەدا ئاماژەی بۆ کرابوو. دوای هەندێک

سەرکەوتنی پێشوەختە لە شوێنەکانی وەکو ڤەنزوێلا، لە ماوەی دەیەیەکدا بەرنامەکە لە ئەفریقا دەشلۆقێت. جگە لە چەند پرۆژەیەکی نمایشکاری کەم، تەنانەت هەوڵی ڕزگارکردنی کیشوەرکە لە مەلاریا نەدرا.

ژێرخانی تەندروستی زۆر لاوازبوو و کێشەکەش زۆر گەورە؛ کەواتە ڕیشەکێشکردن ئەستەم دەبێت لە کیشوەرەکە. بۆیە کەس هەوڵی بۆ نەدا.

لە هیندستان بۆ ڕووبەری تەواوی وڵاتەکە، تەنها بوونی دەستەیەکی ناکارای ۱۵۰ هەزار کەسی، و نەبوونی چاودێری تەندروستی بنەڕەتی لە تەواوی زۆربەی وڵاتەکەدا، هەروەها کێشەی گەشەسەندووی بەرهەڵستی مێشوولە بۆ مێروکوژی DDT هەموویان کۆبوونەوە بۆ ئەو دەرئەنجامەی کە ڕیشەکێشکردن ئەستەمبێت.

لە شوێنەکانی دیکە، وەکو بەڕازیل، تەوژمی ڕیشەکێشکردن لەگەڵ بەرنامەیەکی کارکردەی پێشتر بۆ جڵەوکردنی مەلاریا بەریەککەوتن، بەڵام سەرکردایەتی تەندروستی جیهان لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(who)، ڕێکخراوی تەندروستی وڵاتە ئەمریکیەکان و ویلایەتە ئەمریکیەکان وەکو گەورە بەخشەری سەرەکی هەر دەستیان بە بەرنامەکە مایەوە.

لە بەڕازیل و مەکسیک کە کەم تا زۆر ناچاربوون ڕیشەکێشکردن پەسەندبکەن، سەرکەوتنی سەرەتایی لەگەڵ بەرنامەکە شکستەکانی کۆتایی لە گەڵدا هات: MEP کشایەوە و بەدڵنیاییەوە (مێشوولەکان، گەڕانەوە) ئەوان بە بەرگرییەکی زۆر کەم و هیچ بەرنامەیەکی جڵەوکردنی مەلاریا جێهێڵدران. دواتر بەرهەڵستی هات: سەرەتا تا ساڵی

١٩٦٩ پەنجـــا و شـــەش جـــۆری مێشـــوولە پەرەیــان بە بەرهەڵستیدابوو بۆ DDT؛ دواتر لە ئەنجامی دەرمان پێدانی بێ باکانەی بەرفراوان مەلاریای بەرهەڵستیکاری دەرمان پەرەیسەند بە تایبەت بەرهەڵستکاری دەرمانی کلۆرۆکوین. MEP هەنـدێک سـەرکەوتنی بەدەسـتهێنا. مەلاریـا ٣٩٪ کەمبـووەوە لە ئەو وڵاتـانی کە ناویـان لە بەرنـامەکەدا تۆمـارکرابوو، بەشـێک لە وڵاتـانی دەریـای کـاریبی و ڕۆژهەڵاتی ئەوروپا لە مەلاریا پاکبوونەوە.

هێشـتا، لە سـاڵی ١٩٦٩ کە ڕونبـووەوە بەرنـامەکە کارناکات، ڕێکخراوی تەندروستی جیهان(who) بەرنامەکی داخست.

بە چـڕی سـەرنجی خسـتنە سـەر یەک چارەسـەری تەکنەلـۆژی بـۆ کێشـەی مەلاریـا و لە هەمـان کاتـدا پشتگوێخسـتنی چوارچێـوەی سیاسـی و کـۆمەڵایەتی نەخۆشیەکە، زیادبوونی نیگەرانیەکان دەربارەی سەلامەتی مێروکـوژیDDT، بە تـایبەت دوای بڵاوبـوونەوەی پەرتـووکەکەی ڕاچـڵ کارسـۆن Silent spring؛ و بەرهەڵستی بۆ مێروکوژ و دەرمانی دژە مەلاریا، نەبوونی پابەنـدبوونی دارایی_هەمـوو ئەمـانە یارمەتیـدەرن بـۆ ڕوونکردنەوەی شکستی (MEP).

لە ساڵی ١٩٦٠ بە دواوە مەلاریا گەڕانەوەیەکی ترسناکی ئەنجامدا. لە هەندێک شوێن کە بەرەوپێشچوونێکی بەرچاو هەبوو لە دۆسیەی مەلاریا، وەکو هیندستان و بەڕازیل، سەرلەنوێ سەرهەڵدانەوە هەبوو.

لە سـەرەتای سـاڵانی دەیەی ١٩٦٠ هیندسـتان لە ژێـر باری سەد هەزار حاڵەتی توشبوون بوو؛ تاکو ساڵی ١٩٦٥

به ڕێژەی ١٥٠٪ بەرزبووەوە، بە زۆری بەهۆی چاودێری و بەدواچـوونی بـێ کـاریگەر لە ئەو ناوچـانەی کە ژێرخـانی تەندروســـتیان لاواز بــوو؛ هەروەهـــا ســـەرچاوەی بـاوەڕپێنەکراوی DDT بـوونی بەرهەڵســتی، دەســتیان لە ڕوداوەکاندا هەبوو.

لە ئەفریقـا کە مەلاریـا هەرگیـز لە ژێـر جڵەودانەبـووە، بـارودۆخەکە لە زامبیـا و سـویزلاند خراپتربـوو، مەلاریـا دەرپەڕی بە هۆی پێشکەوتنی نوێی کشتوکاڵی، HIV\ئائایدز، زیادبوونی هەژاری، و خورانەوەی کاریگەری مێروکوژەکان و دەرمـانی دژە مەلاریـا. زیـادبوونی جـوولەی دانیشـتوان و ژێرخانێکی تەندروستی پەککەوتوو کێشەکەی قورسترکرد.

شـێوازەکانی گەشـەی ئـابووری جیهـانی بـووە هـۆی گەشەسـەندنی نایەکسـانی ئـابووری، بـوونی قەرزی گەورە (ئەمەش سەرچاوەی کەمتری بۆ بەرەنگابوونەوەی مەلاریا و نەخۆشییەکانی دیکە هێشتەوە).

دووبـارە سـەرهەڵدانەوەی مەلاریـا ڕێبـازێکی دیـکەی جیهـانی بـۆ جڵەوکردنـی نەخۆشـییەکە بە دوادا هـات، بەرنـــامەی پاڵپشـــتیکراو لە لایەن_بـــانکی نێودەوڵەتی_بەرەنگـاربوونەوەی مەلاریـا لە سـاڵی ١٩٨٨ دەسـتپێکرد، بەرپەرچـدانەوەی مەلاریـا، کۆبـووەوە لەگەڵ دەرمـاڵەی سـندوقی جیهـانی بـۆ ئایـدز و سـیل و مەلاریـا یارمەتیـدا بۆ ڕاکێشـانی سـەرنجەکان بۆ لای نەخۆشییەکە. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە دەرمـاڵەی بەرنـامەکە هەندێک زیادبکات. هێشتا مەلاریا بەرەوپێش شەپۆلی دەدا. لە کاتێکدا کە سـەرنجی نەدەخستەسـەر ڕیشەکێشـکردن، و ئەفریقـای لەخـۆ دەگـرت، بەڵام بەرپەرچـدانەوەی مەلاریـا لە چەنـد

ڕوویەکی گرنگ وێنەدانەوەی MEP بوو: هیچ هەژمارێک نەکرابوو بۆ ئەوەی کە هۆکاری دووبارە سەرهەڵدانەوەی حاڵەتەکان چی بوو؛ بەرنامەکە لە ئەو شوێنانەی کە ژێرخانی تەندروستیان لاوازبوو بەکارخرابوو؛ هەروەها هەوڵەکان لەگەڵ کارەکانی دیکەی گەشەپێدان هەماهەنگیان نەبوو؛ دووبارە لە هەژماربۆکردنی بارودۆخە ناوخۆیەکان شکستیهێنا.

لە کاتێکدا تۆڕی نووستنی چارەکراو بە مێروکوژ، کە تەکنەلۆژیای سەرەکی بەرنامەکەبوو، لە زۆر شوێندا کاری باشی کردبوو_کە WHO بانگەشەی ئەوەی دەکرد، ئەوان بەرپرسن لە کەمکردنەوەی ڕێژەی مەلاریا بۆ نیوە لە ئەفریقا لە ساڵی ٢٠٠٠، هەروەها تۆڕەکە بە شێوەیەکی بەرفراوان، وەکو تۆڕی ڕاوەماسی لە نایجیریا و مۆزانبیق و لە شوێنی دیکە بەکاردەهێنرا. لە پێدانی بژاردەی ڕاوەماسی بۆ خواردن یان بەکارهێنانی تۆڕەکان بۆ مەبەستی دیاریکراوی خۆی، ملیۆنەها خواردن هەڵدەبژێرن. زیادبوونی ڕاوەماسی کاریگەری خراپی لەسەر سامانی ماسی هەبوو.

تەکنەلۆژیاکە ئەندازە کرابوو بۆ یارمەتیدانی خەڵکی لەخۆ دوورگرتن لە مەلاریا لە جیاتی ئەوە بۆ خۆ بەدوورگرتن لە برسێتی بەکارهێنرا، بەڵام لە پرۆسەکەدا ڕاوکردنی ماسی زیادەڕۆ ئەنجامەکان دەبات بەرەو خستنە مەترسی ئەو سەرچاوەی خۆراکەی کە پشتیان پێ دەبەست.




٤. له سەرانسەری جیهان له ماوەی سالانی دەیەی ۱۹٥۰، هەلمەتی ڕیشەکێشکردنی مەلاریای ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی (WHO) بە باشی بانگەشەی بۆ کرابوو لە ڕێگەی

پـولی یادگـاری و پۆسـتەر (وەکـو ئەوەی کە لە ئێـرە هەیە)، هەڵمەتی ڕادیۆ، و شێوازەکانی دیکەی بانگەشەکردن.

هیچ کام لە ئەو بەرنامـانە سەرنجیان نە خستەسـەر ئەو بارودۆخـانەی کە لە سـەرەتاوە بـوونە هـۆی دەرکەوتنـی مەلاریـا. بـۆ نمـوونە ئێسـتا دامەزراوەی گەیـتس زۆربەی پارەکەی بۆ پەرەپێدانی ڤاکسین ئاراستە دەکات؛ هەروەها دامەزراوەکە ئـــارەزووی ڕیشەکێشـــکردنی دووبـــارە زینـــدووکردەوە. لە مـــانگی ئایـــاری ٢٠١٥ لە ئەنجـــومەنی تەندروســـتی جیهـــانی، ڕێکخـــراوی تەندروســـتی جیهانی(WHO) خۆی دووبارە پەیوەستکرد بە لەنـاوبردنی مەلاریا. بە تەنها سـەرنج خستنەسـەر یەک نەخۆشـی_هەر چەنـــدە جیهـــان خـــۆزگەی بە لەنـــاوچوونی مەلاریـــا خواستبێت_لەوانەیە بەرنامەکە لێکەوتی خراپی هەبێت.

بـۆ نمـوونە، هەر چەنـدە لە کەمکـردنەوەی مەلاریـا لە شـوێنەکانی وەک زامبیـا کە لە هەڵکشـاندابووە سـەرکەوتن بەدەســـتهاتووە، بەڵام لە ئەم دوایيـــانەدا مشـــتومڕی ئەوە کراوە کە ئەم سەرکەوتنە لەسەر حسابی جۆرەکانی دیکەی دەسـتێوەردانە تەندروسـتیەکان بـووە. سـەرنج خستنەسـەر نەخۆشـییەکی تـاک وەک مەلاریا دەتوانێت سەرچاوەکان لە ئەو بەرنامانە دوور بخاتەوە کە جەخت لەسەر تەندروستی گشتی کۆمەڵ دەکەنەوە.

یەکێک لە گەورەترین هەڕەشەکان بۆ جڵەوکردنی مەلاریا بەرهەڵسـتی دەرمـــانە. لە کاتێکـدا کە بەرهەڵسـتی ببـــووە جـێگەی نیگەرانـی لە کـاتی سـەرهەڵدانی دژە مەلاریـا و مێروکوژەکان، کێشەکە گەشەی کردووە لە کاتێکدا لە پێگەی

کەمکراوەتەوە یان کێشە زیاتر هەنوکەییەکان ڕکێفیان بە سەردا کێشاوە.

ئێستا ئارتەمیسینین، کاریگەرترین دژە مەلاریای درێژماوە، کەم و کەمتر بەکەڵک دەبێت. لە سەرەتای سەدەی بیست و یەک بەرهەڵستی ئارتەمیسینین هاتە کەمبۆدیا؛ لە سەرەتای ساڵی ٢٠١٥ مەلاریا ڤاڵسیپارومی بەرهەڵستیکاری دەرمان ١٥٠٠ میل بڵاو بووەوە لە ڕێگەی کۆچکردنی مرۆڤ و هەڵگرەکانەوە بۆ سنووری نێوان هیندستان و میانمار. ئەگەر مەلاریای بەرهەڵستیکاری ئارتەمیسیۆن بگات بە ئەفریقا، ئەوە ئەنجامەکان کارەساتبار دەبن.

دۆزینەوەی چارەسەرێکی تەکنەلۆژی بۆ کێشەی مەلاریا، جا تۆڕی نووستن بێت یان دەرمانی کاریگەرتر، لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە خەونی جڵەوکردنی مەلاریا بووە، هەر لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە؛ مەلاریا خاڵی ناوەندە لە دڵی ئینجیلی جڵەوکردندا، تێهەڵچوونەوەکە ئاشکرایە، لە ناوەڕاستی سەدەی بیستدا وا دەردەکەوت هەموو پارچەکان لە جێی خۆی بێت بۆ گەیشتن بە ئەو ئامانجەی کە زۆر ئاسانتر دیاربوو جڵەوکردنی هەڵگر لە ڕێگەی تەکنەلۆژیاوە لە جیاتی بڕیاردانی دروست بۆ جڵەوکردن، یان هێورکردنەوە، ئەو بارودۆخانەی کە یارمەتی سەرهەڵدانی مەلاریا دەدات لە سەرەتادا.

# بەشی چوارەم

# کۆلێرا

نەخۆشیەکی ترسناکە بڵاودەبێتەوە و دروستدەبێت بە خواردنەوەی ئاوی پیسبوو بە پاشەڕۆی مرۆڤی توشبوو.

نیشانەکانی_پێستی زەردی، بزرکاو، ڕووخسارێکی خۆڵەمێشی و تارمایی ئاسا؛ فرکاندنی خێرا و زۆرجار کوشندەی هەموو شلەکانی لەش_لەناکاون و خێرا دەردەکەون دوای توشبوون بە بەکتریای ڤیبریۆ کۆلێرا. بۆ چەندین سەدە کەس نەیدەزانی چۆن چارەسەری بکات پاشان لە سالآنی دەیەی ١٩٦٠ تویژەرانی پزیشکی و پزیشکان کە لە بەنگلادیش کاریان دەکرد دیاریانکرد کە تێکەڵەی خوێ، شەکر، و ئاو دەتوانێت جێگەی ئەو شلانەی کە بەهۆی نەخۆشیەکەوە لەدەستچووە بگرێتەوە و (سکچوون بە گشتی). چارەسەری ئاو پێدانەوە لە ڕێگەی دەم لە ئەو کاتەوە ملیۆنان ژیانی ڕزگارکردووە.

هەر چەنــدە نەخۆشــی کــۆلێرا بە لایەنــی کەمەوە لە ســـەدەی هەژدەوە لە هیندســـتان بـــوونی هەبـــووە، بەڵام بڵاوەپەتـای سـاڵی ١٨١٧ بەهـۆی قەبـارە و توندیەکەیەوە، بە شـێوەیەکی ئاسـایی بە سـەرەتای مێـژووی کـۆلێرا وەک نەخۆشــیەکی پانەپەتـا دادەنرێـت. لە ئەو کـاتەوە حەوت بڵاوەپەتای کۆلێرا بە زەویدا بڵاوبوونەتەوە. شەشی یەکەم ئەوەی پێی دەگوترێت "کۆلێرای کلاسیک" ( V. cholerae O1) بـوون. لە کۆتایدا هەریەک لە ئەو شەشـە کەمبوونەوە و کۆلێرا بەرەو باشووری ئاسیا کشایەوە. بۆ ماوەی سی و هەشـت سـاڵ لە نێـوان سـاڵانی ١٩٢٣ تـا ١٩٦١ پانەپەتـای کــۆلێرا نەمــا. پاشــان لەبەر چەنــد هۆکارێــک کە هێشــتا نەزانــراوە، جــۆرێ زینــدەیی ئەل تۆر_نــاونراوە بە نــاوی شـوێنی دۆزینەوەکەی لە میسر_دەستیکرد بە جێگرتنەوەی کۆلێرای کلاسیک، حەوتەمین پانەپەتـای بەردەوامـی کـۆلێرا دەستپێکرد.کۆلێرا بە پـێچەوانەی سـیل، بەشـێک نەبـوو لە ژیـانی ڕۆژانە؛ لە بـارودۆخێکی نادیـاردا دەرکەوت، بە بـێ ئاگـــــــاداركردنەوە، لە ڕۆژهەڵات، لە ئەو ڕۆژهەڵاتەی کە بەردەوام نــــامۆیی و تـــــرس و کیـــــنە بەرامـــــبەری لە زیادبووندابوو.

کۆلێرا هۆکار و چارەسەرەکەی نەزانراوبوو. جا کە بـوو بە نەخۆشیەکی شارنشینانی هەژار و کۆچبەرانی هیندستان و شوێنانی تر، بووە هێما بۆ پیسـی و کۆنەپەرستی. کۆلێرا نیگەرانیەکـانی ئاشـکراکرد، و دابەشـکاریە قووڵەکـانی نێـو پزیشـکی دەرخسـت، و نایەکسـانی کـۆمەڵایەتی و ئـابووری هەڵمـاڵی لە شـوێنەکانی وەک پـاریس و لەنـدەن و ناپـل و هامبورگ.

لە کاتێکدا هەندێک بابەتی هاوبەش لە نێوانیان هەیە، وەکو مشتومڕ لەسەر هۆ و چارەسەرەکانی، ترس لە نیشانە و کاریگەریەکانی، بەڵام لە هەر جۆرە پانەپەتایەکی کۆلێرا جیاوازبووە. ئەو پانەپەتایەی لە بەریتانیا لە ساڵی ١٨٣١-١٨٣٢ زۆر کەمتر توندبوو بەراورد بە ١٨٤٨-١٨٤٩، دوو ئەوەندە کەس لە ئەوەی دواییدا گیانیان لەدەستدا، بەڵام کاردانەوەی کۆمەڵگە بەرامبەری زۆر کەمتر هەستکردن بوو بە ترس. حەوتەمین پانەپەتا کە ئێمە لە ناوەڕاستیداین ئەوروپای بە سەلامەت جێهێشت، کە لە ساڵی ١٩١١ کۆلێرای تێدا دەرنەکەوتووەتەوە. بەڵام لە ساڵی ٢٠١٠ ڕێگەی بۆ هایتی کردەوە، کە لە ئەوێ بۆ ماوەی سەدەیەک بوو تێیدا نەبینرابوو.




٥. ترس لە بێگانەکان گەشتە لوتکە لە ماوەی بڵاوەپەتاکانی کۆلێرا. ئەم کاریکاتێرەی ساڵی ١٨٨٣ کەشتیەکی کۆچبەران پیشاندەدات کە کۆلێرا بۆ کەنارەکانی ئەمریکا دەهێنن.

ئەفریقـــا، کە ڕووبەڕووی کـــۆلێرای تونـــد نەببـــووەوە تـــا چوارەم پەتای ساڵی ١٨٦٥، ئێستا لە هەموو شوێنێک زیاتر دووچاری کۆلێرا دەبێت.

بوونی کۆلێرا لە شوێنێکدا و نەبوونی لە یەکێکی تر، بۆ هەندێک لە چاودێران، جیاوازی بنەڕەتی دەرخست لە نێوان پـــاک و هـــاوچەرخ، پـــیس و دواکەوتـــوو. نووســـەرێکی فەرەنسی، ئاماژەی بە ئەوە کرد، کە وا دیاربوو بۆ ئەو کە نەخۆشیەکە داگیرکاری بەربەرییە لە هیندستانەوە، لە ساڵی ١٨٣٣ نووسیویەتی "هۆکار هەیە بیر لە ئەوە بکرێتەوە کە ئەگەر خەڵکی کەنارەکانی ڕوباری گانج شانسی ئەوەیان هەبووایە کە لە ژێر سایەی حکومەتە ئازادەکاندا ژیابان ئەوا ئەو پەتایانەیان ڕامدەکرد کە ڕووبارەکەیان دەیڕشێنێتەوە بۆ ژەهراویکردنی بەشەکانی دیکەی زەوی. بازوی ئازادی ئەو دڕنـــدە پیســـانە لە ســـەرچاوەکەی خۆیـــانەوە کۆتـــایی دەهێنێت."

کۆلێرا هێمای دەکرد کە گۆی زەوی بچووکتر و زیاتر پێک بەستراو دەبێت، چونکە ئێستا سنوورەکانی بە ئاسانی لە لایەن نەخۆشیەکانەوە دەبڕدرێن. نوێنەری فەرەنسا بۆ کۆنفرانسی تەندروستی نێودەوڵەتی ساڵی ١٨٥١ ئاماژەی کرد:

بۆ ئێستا، پەیوەندیەکانی نێوان خەڵکی بۆ زیاد بکە، ئەمڕۆ بە ژمارە و خێرایی زیاتر و زیاتر؛ دەریاوانی بە کەشتی هەڵم، هێڵی شەمەندەفەر، لە سەرووی ئەوانەوە ئەم مەیلـــی دڵخۆشـــانەی دانیشـــتوان بـــۆ ســـەردانی یەکتـــر، تێکەڵبوون، یەکگرتن، مەیلێک کە وا دیارە خەڵکی جیاواز دەکات بە خێزانێکی تەنها و گەورە. تۆ ناچار دەبێت دان بە

هەمان شتدا بنێیت بۆ نەخۆشیەکی وەها، بەو جۆرە بەربڵاو و لەو بارودۆخــــانەدا، گەمـــارۆدان و دابڕانـــدن نەک هەر بێدەســـــەڵات و بێســـــوودن، بەڵکـــــو لە زۆربەی زۆری حاڵەتەکاندا، ئەستەمن."

لە کوێوە کۆلێرا هاتووە؟ دەستپێک لە سـەرەتای دەیەی ١٨٣٠، زۆرینەیـان وای بـۆ دەچوون کە وەڵامەکە بـریتییە لە هیندسـتان_بەنگاڵ بە تـایبەت ئاسـیا بە شـێوەیەکی فراوانتـر. توێژینەوە بۆ مێژووی سروشتی کۆلێرا لەم ساڵانەی دواییدا بنەچەی کولێرای کەمتر دڵنیا هێشتەوە_بە هـۆی سروشتی خۆ گۆڕی، هاوشێوەبوونی نیشانە و دەرکەوتنی بـۆ زۆرێک لە نەخۆشـییەکانی دیکەی کۆئەنـدامی هەرس، ناسـەقامگیری جینـۆمی و توانـای گەشـانەوەی لە ژینگەی ئاویـدا_لە سـەر ئاسـتی جیهـان پێشـنیاری ئەوە دەکـات کە کـۆلێرای ئاسـیا، ئەوەنـدە بە دڵنیـایەوە لە سـەدەی نـۆزدە دەستنیشـانکراوە لەوانەیە بە تەواوەتی ئاسیایی نەبێت.

ئەمەش ئەگەری ئەوە دەکاتەوە کە ئەو پەتا هاوشـێوانەی کۆلێرا لە ئەوروپا پێش ساڵی ١٨١٧ لە ڕاسـتیدا کۆلێرابوون. ئەگەرێک لە سـەدەی نۆزدەدا فەراموشـکرا لە لایەن ئەوانەی کە نەیاندەتوانی وێنای کۆلێرا بکەن جگە لە وێناکردنی وەکو نەخۆشیەکی هیندی.

هاوەڵی هیندسـتان لەگەڵ کۆلێرا بـۆ هەمیشـە ئەو وڵاتەی نەنگ کرد.

لەبەر ئەو هۆکـــــــارانەی کە بە تەواوەتــــــــی ڕوون نیـن_لەوانەیە ئەمە چەشـنێکی نـوێ بووبێت؛ لەوانەیە دەیـان ســـاڵ تێپەڕبووبێـــت کە کـــۆلێرا لە هیندســـتان ســـەری هەڵدابێت_نەخۆشـییەکە بە تـایبەت لە سـاڵی ١٨١٧ تونـدبوو،

بە هـۆی ئەوەوە دوان لە پزیشـکانی کۆمپانیـای هینـدی ڕۆژهەڵات لە ساڵی ١٨١٩ ئاوا وەسفی دەکەن: "ترسناکترین و کوشندەترین نەخۆشی" کە "لە سەردەمەکانی هاوچەرخدا لە هیندستانی داوە" لە کاتێکدا بە پێی مەودای خەمڵاندنەکان، لە نێـوان سـاڵانی ١٨١٧ و ١٨٣١ کـۆلێرا بە ئەگەری زۆر ملیۆنەهـا هینـدی کوشـتووە، کە زۆربەیـان خەڵکـی لادێـی هەژار و کەم خۆراکبـوون. کـۆلێرا لە هەمـوو کیشـوەرەکە بڵاوبووەوە، بەڵام بەنگاڵ لە هەمووی خراپتر لێیدرا.

کۆلێرا زیاتربوو لە هێمایەک بۆ جیاوازی یان جیهانێکی پێکەوە بەستراو. بەڵکو لە ڕاستیدا بوونی هەبوو. گەیشتنی سەیر و کتوپڕ بۆ ئەوروپا لە ساڵی ١٨٣١ زۆرێکی خستە نێو ترس و تۆقینەوە؛ بۆ هەندێک ئاماژەی هاتنی تاعوونێکی نـوێی کـرد. هەنـدێک کەس هەڵهـاتن، هەروەک چـۆن ئەنجامیاندا لە کاتی بڵاوەپەتای تاعووندا، ئەوانی تر مانەوە. ترس لە کۆلێرا لە هەندێک کاتدا گونجاو نەبوو لە بەرامبەر هەڕەشەی راستەقینە. لە ساڵی ١٨٣١، کە کۆلێرا لە ڕووسیا ڕێگەی بۆ خۆی خۆشکرد، ئینگلیزە نیگەرانەکان چاوەڕێی گەیشتنی کۆلێرایان دەکرد.

ڕۆژنـامە، نـامیلکە و دەنگـۆ و تـرس لە نەخۆشـیەکەیان بڵاوکردەوە. بەڵام دکتۆر جەیمس جۆنسن سەرنووسەری گۆڤاری Medico-Chirurgical Review، لە نامەیەکدا بۆ تایمز ڕۆژنامەکەی ئاگادارکردەوە: "هیچ گومانێک نابێت کە نەخۆشـی ترسـناکی تـۆقین لە کـۆلێرا لە ئەم سـاتەدا دەقلیشـێتەوە، بە شـێوەیەکی پەتـایی، لە هەمـوو شـوێنێکی دورگەکانی بەریتانیا. تۆقین لە کۆلێرا بەریتانیەکان تا مردن

دەترسـێنێت بە ژمـارەیەکی زۆر گەورەتـر لە لەنـاوچوون بە بوونی ڕاستەقینەی خودی نەخۆشیەکە.*

بینینـــی بەڵـــگە لەســـەر کـــاریگەریە تێکـــدەرەکانی کە لە ڕووسـیا بەرەو بەریتانیـای گەورە بەڕێکەوت، نووســەرێکی ترساو لە گۆڤاری Quarterly Review هۆشداریدا:

ئێمە لە ڕۆژانـی خۆمانـدا شـاهیدی لەدایکبوونی درمێکـی نوێ بووین، کە لە ماوەی کورتی چوارده ساڵدا، باشترین

بەشـەکانی جیهانی وێرانکرد، و بە لایەنـی کەمەوە پەنجـا ملیـۆن لە ڕەگەزەکەمـانی لەنـاوبرد. ئەو ڤایرۆسـە لەگەڵ هەمـوو جۆرە کەش و هەوایەک دەسـتو پەنـجەی نەرمبووە، بەسـەر هەمـوو بەربەسـتێکی سروشـتیدا سـەرکەوتووە، هەموو خەڵکێکی بەزاندووە.

هەروەها وەک گرەبایەک نەبوو، کە گڕ لە ژیان بەربدات، پاشان دوربکەوێتەوە؛ کۆلێرا، وەک ئاوڵە یان تـاعوون نییە، ڕەگ لە ئەو خـاکەدا دادەنێـت کە بـۆ هەر جارێـک دەسـتی پێبگات.

لە بەریتانیـا، لە سـاڵی ١٨٣٢، لە چەنـدین نـاوچە ئـاژاوە هەڵگیرسا، کە هات لە پاشـینەی چەنـدین ڕووداوی دزیکردن لە گۆڕ کە زۆر بڵاوکرایەوە، هەروەهـا یەکێک لە ترسـناک و زۆر باسـکراوترین ڕوداوی کوشـتن بـۆ دەسـتکەوتنی لاشـە، خەڵکـی تـووڕەیی خۆیـان ئاراسـتەی پزیشـکەکان کـرد کە گومانیـان لە ژهەراویکردنـی هەژاران هەبـوو لە هەوڵدان بـۆ کـۆکردنەوەی لاشـە بـۆ وانەکـانی توێکـاری قوتابخـانەی پزیشـکی. لە فەرەنسـا هەنـدێک نیگەرانبـوون لە ئەوەی کە دەوڵەمەنـدەکان پیلانیـان بـۆ ئەوە دارشـتووە کە هەژارانـی توشبوو بە کۆلێرا لە کۆڵبکەنەوە.

کۆلێرا کولتووری باڵاو زیندووی ڕۆژئاوای هێنایە بەر گومان: چۆن نەخۆشییەک لە ڕۆژهەڵاتی سەرەتایی و دواکەوتووەوە هێزی ئەوەی هەیە ڕۆژئاوای هاوچەرخ و پێشکەوتوو کەنەفت بکات؟ کۆلێرا بارودۆخی ژیانی ترسناکی ئاشکراکرد لە شارە پێشکەوتووەکانی ئەوروپای خێرابوو بە پیشەسازی، لەوانەیە زۆرێک لەو شتانەی کە ئەوروپا هاوچەرخ دەکات هەر ئەو شتانە بوون کە بوونە هۆی کۆلێرا؟گومڕاکەربێت یان نا، ترس گرنگە. کاتێک کۆلێرا لە ناپل دەرکەوت لە ساڵی ١٩١١، دەوڵەتی ئیتالیا زۆر ترسی لە دەرئەنجامە شاراوەکانی هەبوو؛ کەمکردنەوە یان کەنەفتکردنی بازرگانی و گەشتیاری؛ سنووردارکردنی کۆچکردن؛ ئەو تێڕوانینەی کە ئیتالیا بەشێک نیە لە جیهانی هاوچەرخ و تەندروست بۆیە هەواڵی پەتاکەی لە جیهانی دەرەوە شاردبووەوە.هەندێک لە نهێنیەکانی کۆلێرا، نهێنی گەلێک کە سنووردارنەبوون بە کۆلێرا زۆربەی سەدەی نۆزدەی لەگەڵ خۆی برد بۆ وەڵامدانەوە و گفتوگۆکردن، نهێنیەکانی کۆلێرا ماوەی سەدەیەکی خایاند.

لەو کاتەوەی هەموو کەس بە یەکسانی کۆلێرای نە دەچەشت، زۆرێک سەرسامبوون کە بۆچی هەندێک کۆلێرایان گرت و ئەوانی تر نا. ئایا درم بوو، وەک زۆرێک لە ساڵانی ١٨٣٠ باوەڕیان وابوو کە ئاوڵە و تاعوون وابوون؟ ئایا هەڵاوی بۆگەن بووە هۆی؟ یان تێکەڵەیەکبوو لە ئەو دووانە؟ بە شێوەیەکی گشتی درمبوون بە واتای پشتگیریکردنی ئەو جۆرە ڕێکارانەبوو وەک دابڕاندن.

ئەوانەی باوەڕیان بە هەڵای بۆگەن بوو دابڕاندن بەلای ئەوانە بێسوودبوو؛ ئەوە خەڵک نەبوو کە نەخۆشییەکەیان

دەگواســـتەوە، بەڵکــو هەڵقــوڵانی بــۆگەنی نــاوچەکەبوو، ســەوزەی گەنیــو و پاشــەڕۆی ئــاژەڵی لە خــاک و ئەو هەوا بۆگەنەی کە بەرهەمیان هێناوە. هیچ دابەشکردنێکی توند لە نێــوان هەردوو بیــردۆزەکەدا نەبــوو. هەر چەنــدە، هێنــانە پێشەوەی بیردۆزێکی دروست ئاستەنگبوو، چونکە بنەمای شیکاری کەم هەبوو بۆ هەڵبژاردنی هەندێک لە زانیاریەکان نەک ئەوانی تر؛ زۆربەی حەزیان دەکرد باوەڕبکەن بە هەر شتێک کە گونجاوبێت لەگەڵ بیردۆزەکەیان.

نووســـەرێک لە گۆڤــاری The lancet شـــتەکانی کـۆکردەوە و وتـی: "پێشـکەوتنی پزیشـکی، وەک زانسـتێکی هەڵهێنجــانی، دواکەوتــووە بە دروســـتکردنی بیردۆزەیـــی گریمــانەیی، یــان دانــانی بنەماگەلێـک کە بە تەواوی ڕەهــا و خەیــاڵین، هەروەهــا بە دەرهێنــانی بنەمــا گشــتییەکان یــان دەرەنجامەکان، لە ژمارەیەکی سنوورداری زانیاری."

لە کاتێکدا مشتومڕ دەربارەی ڕێگای گواستنەوەی کۆلێرا دەمەزەردبــوو و بــۆ دەیــان ســاڵی دیـکەش هەروا دەبێـت، پێویستبوو شـتێک بکرێـت لە کـورت مـاوەدا. لە ئەم ڕووەوە وا دەردەکەوت کە زۆربەی شوێنکەوتوانی بیردۆزی درم: لە دەوڵەتە ئازادیخوازەکــانی وەک ئینگلســتان و فەرەنســاوە تــا تاکڕەوەکـانی وەک ڕووسـیا و نەمسـا هەنگاریـا و پڕووسـیا، وەڵامــدانەوەی ســـەرەتایی بریتیبـــوو لە چارەســـەرکردنی نەخۆشـیەکە لەســـەر بنەمــای ئەزمــوونی مێژوویـــی لەگەڵ تاعوون و سەپاندنی دابڕاندن و سنووردانان لەسەر گەشت.

دەوڵەتەکــان کــرداری ســـەپاندنیcordon sanitaire (سنووری تەندروستی)یان زیندوو کردەوە، لە هەوڵدان بۆ هێشـــتنەوەی کـــۆلێرا لە دەرەوە؛ ئەوان بەوریــــاییەوە

چاودێرییان لەسەر نەخۆشەکان و کەسە گومانلێکراوەکان هێشتەوە، جیاکردنەوەیان بە پێی پێویستبوو، ئەوان ناوچە تووشبووەکانیان داخست و بە دڵگەرمییەوە خەڵک و شتومەکیان میکرۆب کوژ دەکرد، پاکژیان دەکردنەوە و هەڵمیان لێدەدان.

کاتێک کۆلێرا لە پایزی ساڵی ١٨٣٠ لە مۆسکۆ نزیکبووەوە، ڕووسیا بەرگرییەکی بەهێزی ئامادەکرد؛ ڕێگاکان تێکدەدران، پردەکان وێراندەکران، ڕێڕەوەکان بۆ نێو شار و دەرەوەی شارەکە دادەخران. سوپا سنووردارکردنی لەسەر هاتوچۆ جێبەجێکرد؛ سەرپێچی واتای مەرگبوو. ٦٠ هەزار سەرباز دوو سەد میل سنووری ڕۆژهەڵاتیان پاسەوانی دەکرد.ئەم ڕێکارە توندانە لەگەڵ تێکەڵەیەک لە کەمتەرخەمی و ترس و هەتک و بەرهەڵستیدا کۆکرانەوە. نەخۆشخانە زۆرەملێیەکان نائارامی جەماوەریان لە مۆسکۆ و سان پیتەرسبێرگ هەڵگیرساند. لە ڤیتگرا، خەڵکە توورەکە ئەو نەخۆشانەیان ئازادکرد کە دژی ویستی خۆیان ڕاگیرابوون؛ ئەوان نەخۆشخانەکانیان وێرانکرد.

حکومەتە تاکڕەوەکان تەنها ڕێبازی درمییان لەخۆنەگرت، بەڵکو هەلومەرجی ناوخۆییان لەبەرچاو گرت و ڕێکارە تەندروستییە سادەکانیان گرتەبەر، زۆربەی کات ئاگادارکردنەوەی بێ زۆرەملێیان دەگرتەبەر سەبارەت بە خاوێنی کە زیاتر ئاراستەی هەژارەکان دەکران. ئەگەری ئەوەی کە کۆلێرا هۆکاری ناوخۆیی هەبێت و ئەو ڕاستیەی کە وا دیارە زیاتر ڕاوی هەژاران دەکات، پێشنیاری ئەوەی کرد کە لەوانەیە نەخۆشیەکە تەنها درمی نەبێت. زیادبوونی دوودڵی سەبارەت بە شێوازی گواستنەوەی کۆلێرا،

نارەحەتبوونی خەڵکی لە ئەو سنوورە توندانەی کە لەسەر ژیانی ڕۆژانە دانرابوون، دژایەتی کردنی توندی چینی بازرگان بۆ دابڕاندن و کاریگەریەکانی لەسەر بازرگانی بووە هۆی ئەوەی کە گۆڕانێک ڕووبدات. هەر کە دەوڵەتەکان، پزیشکەکان، هاولاتیان و بەرپرسانی تەندروستی گشتی ئەزموونی زیاتریان لەگەڵ نەخۆشیەکە بەدەستهێنا، سنووردارکردنی سەرەتایی بۆ بازرگانی و گەشتکردن بە شێوەیەک گرانببوو، ئەستەمبوو بۆ جێبەجێکردن. زیاتر، وەک بەڵگەکان دەریانخست کە کاریگەرییان زۆر کەمە، بۆیە حکومەتەکان دەستیان شلکرد.

هەروەها، کاتێک کۆلێرا ڕۆشت بەرەو ئەوروپا بە؛درێژایی ڕێگا بازرگانیەکان، ئەو ولاتانەی کە کۆلێرا چووە نێویان پشتیان بە ئەزمونی ئەو شوێنانەی دەبەست کە پێشتر کۆلێرایان چەشتبوو. ڕووسیا، بۆ نموونە، پیشانیدا کە دابڕاندن بە ئەو شێوەیە کارناکات، هەرچەند سەرەتای کاتی لاوازبوونی یەکەم شەپۆلی کۆلێرا لە ئەوروپابوو لە ناوەڕاستی سالانی دەیەی ١٨٣٠، باوەڕ بە درم لاوازبوو. ترس لە نەخۆشییەکە، زۆر بە توندی هەستی پێدەکرا لە سالانی دەیەی ١٨٣٠، بەلام هەرگیز بە هەمان ئاست نەگەڕایەوە.

ئەمەش زۆر جیاوازبوو لە کاردانەوە بۆ کۆلێرا کاتێک لە سالانی دەیەی ١٨٤٠ و دەیەی ١٨٥٠ هاتەوە. ئەو شوێنانە وەک لۆبک و هامبورگ لە ئەڵمانیا سیاسەتی تەمبەڵیان پەیڕەوکرد. دەسەلاتداران زیاتر نیگەرانبوون دەربارەی کاریگەری سنووردارانان لەسەر بازرگانی و نائارامی خەڵکی وەک دەربارەی کۆلێرا.

بەڵام هەر کە کۆستی سەرەتایی بڵاوەپەتای یەکەم کۆتایی پێهات و نەخۆشیەکە پاشەکشەی کرد، بیرکردنەوە دەستیپێکرد. پشت بەستن بە ئەزموونی مێژوویی لەگەڵ تاعووندا سەلماندی کە بەس نیە؛ ڕوونکردنەوە و شێوازی جڵەوکردنی جێگرەوە پێویستبوو. ئەو بیرۆکەیەی کە کە کۆلێرا بە توندی نەخۆشییکی درمە، لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە تێپەڕدەبێت، وەلاوەنرا. هەروەها ئەو بیرۆکەیەش کە کۆلێرا بەرهەمی ژینگەی نیوخۆیبوو بە تەواوەتی ڕازیکەرنەبوو. چونکە هەموو کەس لە شوێنێکی دیاریکراودا نەیاندەگرت. هەندێک پێیان وابوو کە کۆلێرا سزای یەزدانە بۆ گەوجی و گوناە یان بەهۆی بەدرەوشتی قوربانیەکانیەوە هێنراوە. زۆرێک دەستیان کرد بە تێبینیکردنی پەیوەندی نێوان هەژاری و کۆلێرا. لەوانەیە بارودۆخی ژیان یارمەتیدەربێت بۆ ڕوونکردنەوەی هەڵگرتنی نەخۆشیەکە لە هەندێک شوێن و خەڵک.

پەیوەندی نێوان هەژاری و بڵاوەپەتا لە سەردەمی کۆلێرادا دروست نەبووە؛ هەژاری و تاعوون لە مێژە پێکەوەبەسترابوون. لەگەڵ ئەوەشدا لە ساڵانی دەیەی ١٨٢٠ و دەیەی ١٨٣٠ هەندێک دەستیان بە لێکۆڵینەوەی پەیوەندیەکە بە وردەکاری زیاتر کرد. توێژینەوەی ڕێنی لویس ڤیلرمێ لەسەر ئاماری دانیشتوانی پاریس لە ساڵانی دەیەی ١٨٢٠، کە باری ئابووری کەسەکە، نەک هۆکاری ژینگەیی، باری تەندروستی خراپی دانیشتوانی هەژارترین ناوچەکانی پاریس ڕوون دەکاتەوە.

ولیام فار هاوتا بەریتانیەکەی ڤیلرمێ پەیوەندی هاوشێوەی لە ناوەندەکانی شارنشینی ئینگلستان ئاشکراکرد.

کۆلێرا دەرکەوت لە ئەنجامی هەژاری لە لایەن پیشەسازی و شارنشینێتی خێراوە کە بە زۆربەی ڕۆژئاوا بڵاوببووەوە. ئەم ڕێگایە لە بیرکردنەوەدا بە ئاسانی دەتوانێت درم و هەلاوی بۆگەن جێبکاتەوە. لەوانەیە ئەوە بێت کە هەژارەکان لە بارودۆخی بۆگەندا ژیابن، کە نایابە بۆ بڵاوبوونەوەی پەتایەکی وەک کۆلێرا.

ڕوونکردنەوەی ژینگەیی بۆ کۆلێرا هاتە زاڵبوون.

ئەوەی لە ئینگلستان بوو ئەم تێڕوانینە زۆر دوور ڕۆیی لە بەهێزکردنی کاری گشتی. پەیوەندی نێوان شوێنێکی دیاریکراو و کۆلێرا (و تەندروستی خراپ بە گشتی) زۆر بە دڵگەرمییەوە لە ئامێز گیرا لە لایەن ئێدوین چادویک، کە لە سالانی دەیەی ١٨٣٠ کە بیرۆکراتێک بوو یاساکانی هەژاری بەریتانیای بەڕێوەدەبرد، کە سەرسامبوو بە پەیوەندی نێوان هەژاری و نەخۆشی و پەیڕەوی بیردۆزەی سوودخوازی فەیلەسوف جێرمی بێنتهامی دەکرد، چادویک لەگەڵ چەند پزیشکێک گروپێکی پێکهێنا و لە ساڵی ١٨٤٢ ڕاپۆرتی ڕەوشی تەندروستی دانیشتوانی کارکەری بەریتانیای مەزنی بڵاوکردەوە. ئەو ڕاپۆرتە پڕبوو لە نەخشە و هێڵکاری و ئامارەکان کە گوزارشتی لە پەیوەندی نێوان نەخۆشی و هەژاری و باری تەندروستی گەڕەکە دیاریکراوەکان دەکرد، ڕاپۆرتی چادویک بوو بە ئینجیلی بزووتنەوەی تەندروستی بەریتانی، کە لە ساڵی ١٨٤٨ گەیشتە لوتکە لەگەڵ پەسەندکردنی یاسای تەندروستی گشتی و دروستکردنی دەستەی تەندروستی گشتی. ڤیلرمێ پێی وابوو کە سیستەمێکی ئابووری نادادپەروەرانە جیاوازی توندی لە نێوان دەوڵەمەندان و هەژاران دروستکردووە؛ چادویک، کە

شـوێنکەوتوویەکی پابەنـدی بیـردۆزەی هەڵاوای بۆگەنبـوو، بۆیە چاوی تەنها شـوێنی ڕووی پیس یان خـاوێنی دەبینی. بـۆ ئەو پێویسـتی بە دووبـارە بونیاتنـانەوەی کـۆمەڵایەتی و ئابووری گەورەنەبوو؛ بەڵکو شـارەکان بە سـادەیی پێویستە خۆیان پاکبکەنەوە.

چادویـــک و هاوپەیمانەکـــانی پێشـــنیاری سیســـتەمێکی گەیانـــدنی ئـــاو و ئاوەڕۆیـــان کـــرد کە بەردەوام پاشـــەڕۆ بۆگەنەکـــان دەرپەڕێنێـــت. دیـــدی چادویـــک کە نیـــو ســـەدە دەخایەنێت بۆ جێبەجێکردنی بە تەواوتـی، لەگەڵ سیستەمی ئـــاوەڕۆی پاریســـدا، یەکێـــک دەبـــوو لە کـــارە گەورە ئەندازیاریەکانی سەدەی نۆزدە. لە کاتێکدا کە ئاوی پاک بە دڵنیاییەوە شارەکان تەندروستر دەکات. نیگەرانیەکانی سەر تەندروسـتی هەژاران هەمیشـــە، یـان تەنـانەت زۆرجـاریش پاڵنەری بنەڕەتی نەبووە لە پشت هەرا بۆ ئاوی پاک، بەڵکو بەرژەوەندی بەکارهێنەر و پیشەسازی داوای دەکرد.

بۆ زۆربەی ئەوانەی کە گرنگیان بە چاودێریکردن دابوو، پەیوەنـدی نێـوان شارنشـینی و دۆخـی ژیـانی کەسـاسـی و نەخۆشی ڕوونبوو. کەسانی وەک چادویک باوەڕیـان وابـوو کە ئاوی پاک دەبێتە هۆی دەرپەڕاندنی بۆگەنی و پاشـەڕۆی ژیانی ڕۆژانە کە ببووە هۆی نالەبارکردنی بارودۆخی ژیـان. تەنـانەت کە ئەگەر خـودی ئـاوەکە بە بیـری ئەودا نەهاتبێت. بەڵام ئەوە بەبیری جۆن سنۆ هـات لە کـاتی پێشڕەویکردنی کـاری پەتاناسـی لە لەنـدەن لە مـاوەی بڵاوەپەتـای کـۆلێرای سـاڵی ١٨٥٤. سـنۆ دەسـتیکرد بە بیرکـردنەوە لە کێشـەی کۆلێرا لە مـاوەی سـاڵی ١٨٤٨، پەرتـووکی On the Mode of Communication of Cholera لە سـاڵی ١٨٤٩

بڵاوکردەوە. سنۆ پرسیاریکرد کە ئایا پیسایی قوربانیەکانی کۆلێرا دزەدەکەنە نێو هێڵی ئاو. بۆ سنۆ، کۆلێرا، بە پێچەوانەی ئاوڵە، ڕاستەوخۆ لە کەسێکەوە بۆ کەسێک لە ڕێگەی هەواوە نەدەگوێزرایەوە، لە ئەو کاتەوەی کە نەخۆشییەکە لە ناو گەدەبوو نەک سیەکان. ئەوەی کە کۆلێرا نەخۆشییەکی ئاویە تەنها بیردۆزەیەکبوو، بیردۆزەیەک کە بە زوویی دەتوانرێت تاقیبکرێتەوە.

لە بەجێهێنانێکی ئەفسانەیی پەتاناسیدا، سنۆ شوێنی حاڵەتەکانی کۆلێرای لە کاتی بڵاوەپەتای ساڵی ١٨٥٤ نەخشە کێشاوە بۆ زانینی ئەوەی لە کوێ ئەو کەسانەی نەخۆشبوون ئاوەکەیان وەرگرتووە. پەیوەندیەکە ڕوونبووەوە: لە سۆهۆ، سنۆ ئاشکرایکرد، ئەوانەی کە کۆلێرایان هەیە هەموویان لە هەمان سەرچاوە، پەمپی شەقامی برۆد، ئاویان خواردووەتەوە. دوای ئەوەی سنۆ بە سەرکەوتوویی فشاریکرد بۆ لابردنی دەسکی پەمپەکە، حاڵەتەکانی کۆلێرا بە توندی دابەزی.

ڕوون بوو: شتێک لە ئاوەکەدا هەبوو، بەڵام لە ساڵانی دەیەی ١٨٦٠ هێشتا کەس ئەوە نەیدەزانی چییە، هاوسەنگی بیرورِا دەستیکرد بەلادان بەرەو باوەڕهێنان بە ئەوەی کۆلێرا نەخۆشییەکی پەڕۆکە.

هێشتا ئەوانە هەبوون کە هەڵاوی بۆگەن باشترین ڕوونکردنەوە بوو بۆیان. لە هیندستان، هەندێک پێیان وابوو کە نیمچە کیشوەرەکە زۆر تووشی نەخۆشیەکە بووە، چونکە نەخۆشییەکە لە خاکدابووە و بە هەواوە گوێزراوەتەوە و ڕاوی دەکرد لەسەر دانیشتوانێکی لاواز کە بێ هاوتا لەژێر مەترسی وێرانکارییەکانی نەخۆشییەکە

بـوون. نێردەی دروسـتی هینـدی بیـری لە ئەوە کـردەوە کە دابڕانـدنی کەشـتییەکان یـان دانـانی گەمـارۆی پـاکژی بـۆ ڕێگریکردنـی کۆلێرا لە گـوێزرانەوە "هـیچ لە دانـانی هێڵێکـی پاسەوانی بۆ وەستاندنی بای وەرزی ژیرانەتـر و کـاریگەرتر نابێـت." بەڵام ئەم ڕێگـایە بـۆ بینینـی کـۆلێرا لەگەڵ ئەو شـوێنەی کە بۆچـوونی پزیشـکی بـۆی دەچـوو بەریەک دەکەوتن.

لێـدانی زەنگـی مەرگ بـۆ بیـردۆزەی هەڵاوی بـۆگەن، هەرچەندە سەرەتا بە دەنگی بەرز زەنگی لێنەدا، بەڵام کاری بەکتریانـاس ڕۆبێـرت کـۆخ بـوو لە سـاڵی ١٨٨٣، لە کـاتی پانەپەتای کۆلێرای پێنجەمدا. دوای جیاکردنەوەی بەکتریای چیلکەیـی نەخۆشـی ئەنتـراکس و سـیل، کـۆخ دەسـتدەکات بەکارکردن لەسەر کۆلێرا.

کاتێـک کـۆخ لە ئـاوی پیسـدا بەکتریـای شـێوە فـاریزەی کـولێرا، ویبریـۆ کـۆلێرای دۆزیـیەوە و دەستنیشـانیکرد کە دەبێـت ئامادەبێـت بـۆ ئەوەی نەخۆشـیەکە دروسـت ببێـت، کۆتایی بیردۆزی هەڵاوی بۆگەن لە ئاسۆدابوو.

کـاری کـۆخ و سـنۆ لەگەڵ ڕەزامەنـدی جیهانیـدا نەدەهـاتەوە. هەڵاوی بـۆگەن، زۆر جـار لە شـێوەی لاوازدا، هێشتا هەر بەردەوامبوو. شارەزای بواری پاکژی کاریگەری ئەڵمانی ماکس ڤۆن پێتینکۆفەر بەردەوامبوو لە داکۆکیکردن بۆ دابینکردنی ئاوی پاک، نەک لەبەر ئەوەی کە وای دەزانـی کـۆلێرا نەخۆشـییەکی ئـاوەییە، بەڵکـو لەبەر ئەوەی پـاک و خاوێنی بە گشتی کلیلی تەندروست باشیە. بۆ ئەو کۆلێرا لە بڵاوبوونەوەی ئـاوی ژێرزەمینـی پیسـەوە هـاتووە کاتێک کە خـاکەکە دارمـاوە. بـۆ مـاوەیەک بۆچوونەکـانی پێتینکـۆفەر

کاریگەرییەکی بەهێزی هەبوو لەسەر سیاسەتی تەندروستی ئەڵمانی، بۆ نموونە کاریگەری هەبووە لەسەر ئەو بڕیارەی هامبورگ سەبارەت بە دابینکردنی ئاوی پاکی خواردنەوە بۆ هەژارترین هاوڵاتیانی شارەکە. کاتێک کۆلێرا لە ساڵی ١٨٩٢ بۆ هامبورگ هات، بەڵام بۆ دراوسێکەی ئاڵتونا نەهات، چونکە لە ئەوێ ئاوێکی پاک و خاوێن هەبوو، ئەوانەی باوەڕیان بە بیردۆزەی گواستنەوەی نەخۆشی ئاویی هەبوو کە دواتر زۆربەی زانایانی پزیشکی و ئەوانی تر کە پەیوەندیداربوون بە کۆلێرا، تاوانبارکران، بەڵام پێتینکۆفەر بە جێگیری مایەوە. بۆ سەلماندنی بیردۆزەکەی، ئاوی خواردەوە کە بەکتریای فاریزەیی کۆلێرای تێدابوو و توشی سکچوونبوو، بەڵام بە وتەی ئەو، کۆلێرای تەواوەتی نەبوو. هەروەک ئەو تەماشای دەکرد دانەی ئێکس (ب.چیلکەی) بەس نەبوو، لە نەبوونی باری تەندروستی و کەشوهەوای تایبەتی نێوخۆیی (دانەی Y) بۆ بەرهەمهێنانی نەخۆشییەکی گوێزراوەی نێوخۆیی (دانەی Z).

بەڵام بە هاتنی کاتی تاقیکردنەوەکەی، تێڕوانینی هاوشێوەی تێڕوانینەکانی ئەو بەخێرایی کاریگەری لە دەستدەدەن.لە هەمان کاتدا درمییزم زاڵبوو کە گەشتی دەریا و زەوی خێراتردەبوو، کە ڕۆژئاوای "شارستانی" هێنایە نێو پەیوەندی بەردەوام لەگەڵ ڕۆژهەڵاتی "ناشارستانی" و نەخۆشیەکانی. نیگەرانییەکان سەبارەت بە بڵاوبوونەوەی نەخۆشی بووە هۆی ئەوەی کە پێی دەگوترێت سەردەمی دابڕاندنی نوێ، پشکنینی پزیشکی و سنووردانان لەسەر گەشت و شێوەیەکی بەرزتر لە بە نێودەوڵەتی بوونی پزیشکی.

کۆنفرانسه تەندروستییە جیهانییەکان کە لە ساڵانی دەیەی ١٨٥٠ دەستیپێکرد، دوای ئەوە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک جاڕ دەدرا بۆ ئەوەی گەلان پێکەوە کۆببنەوە و باس لە زیادبوونی گەشت و بازرگانی جیهانی بکەن. ئەوان زیاتر نیگەران بوون لە نەخۆشی، بەتایبەتی کە کۆلێرا لە کاتی حەج بۆ مەککە گواسترایەوە، دوای پانەپەتای ساڵی ١٨٦٥.

لە پانەپەتاکانی پێشوو نیو دەیەی خایاند بۆ ئەوەی کۆلێرا لە هیندستانەوە گەشت بۆ ئەورووپا بکات. لە ساڵی ١٨٦٥ تەنها دووی خایاند، بە هۆی هێڵی شەمەندەفەر و ڕێڕەوەکانی کەشتی هەڵم کە دەریای ناوەڕاستیان بە دەریای سوورەوە بەستەوە.

تاکو هاتنی ساڵانی دەیەی ١٨٧٠ کۆنفرانسەکان بوون بە مەیدانێک بۆ باسکردنی سنووردارکردنی گەشت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هیندستانەوە. نوێنەرە ئیتاڵیاییەکە لە ساڵی ١٨٧٢ ڕایگەیاند: "دەبێت ئەو گەشتیارە نەفرەتیە بوەستن کە لە هیندستان دەژی، هەموو کەس دەیزانێت، لە گەشتەکانی؛ بەلایەنی کەمەوە دەبێت تا ئەوپەڕی پێشکەوتنی بوستێنین لە خاڵی دەستپێکیەوە" ئەوە تەنها هیندستان نەبوو: هەموو ڕۆژهەڵات مایەی هەڕەشەبوون بۆ ڕۆژئاوا، وەک نووسەرێک لە ڕۆژنامەی Times of India لە ساڵی ١٨٩٢ داینـاوە: "مەترسی ڕاستەقینە بۆ ئەورووپا دەکەوێتە شوێنە جیهانیە ئیسلامیەکانی حەجکردنی مەککە، مەدینە، کەربەلا، دیمەشق، قودس، شوێنە جیاوازەکانی وڵاتی فارس و شوێنە گەورەکانی کاروانی حاجیان.... گەندەڵی ڕۆژهەڵات و نەبوونی هیچ، یان هیچ پارێزگارێکی تەندروستی جدی لە

شـوێنە گەورەکـانی حەج، هـانی ئەو نەخۆشـییانە دەدات، کە میکرۆب خـاکێکی بەپیت لە جەستەی حاجیان دەدۆزێتەوە، کە لاوازبووە بەهۆی هەموو جۆرەکانی بێبەشکردن. "خنکان لەسـەر ڕۆژهەلات"، وەک مـارک هاریسـۆن پێـی دەوت، بە درێژایـی کـات خـاوبووەوە کاتێـک وڵاتـانی وەک ئیتالیـا و بەریتانیـای گەورە دەسـتیانکرد بە ڕەتکـردنەوەی سـنووردارکردنی بازرگـانی و گەشـتکردن لە بـازاڕێکی جیهانی کە تـا دەهـات زۆرتـر پێشـبڕکێکەر دەبـوو کە داوای لێشاوی بێ سنووری خەڵک و کاڵای دەکرد. لە هەمان کاتدا، پەیوەنـدی ڕۆژهەلات و بە تـایبەتی هیندسـتان لەگەڵ کۆلێرا هەرگیز وننەبووە،

لە سەرەتای سەدەی بیستدا کۆلێرا زیاتر یان کەمتربوو بە شتێک لە ڕابردوو لە ڕۆژئاوای ئەوروپا و ئەمریکا. ئیتالیا لە سـاڵی ١٩١١ تووشـی بڵاوەپەتـایەک بـوو، کە هەوڵ و کۆششـە بەهێزەکـانی ئەو وڵاتە بـۆ شـاردنەوەی بەڵگەکـانی بـوونی کـۆلێرا ئەوەڕوون دەکـاتەوە کە چەنـدە دەگـمەن و ناپەسەندبووە لە ئەوروپای خێرا بە هاوچەرخ بوودا.

تا ساڵانی ١٩٢٠، نەخۆشیەکە بە توندی خۆی لە جیهانی تـازە پێشـکەوتوو جێگیرکردبـوو، بـاکووریش بـایەخەکەی لە دەستدا. حەوتەمین پانەپەتا گەورەترین کاریگەری هەبوو لە ئەفریقا بە بوونی ٩٠٪ حاڵەتەکان. وەک مایرۆن ئێزنبێرگ بە ڕاسـتی تێبینـی دەکـات، ئەزمـوونی ئەفریقـی پرسـیارێک دەسەپێنێ:

بـۆچی لە کاتێکـدا کە زیـاتر و زیـاتر دەربـارەی کـۆلێرا دەزانـین و چارەسـەری هەرزان و کاریگەرمـان پێشکەشـکردووە، نەخۆشـییەکە تەنیـا خراپتربـووە و ژیـانی

زیاتری کردۆتە قوربانی؟ هەمان ئەو هۆکارانەی کە بۆ سیل و مەلاریا بەردەوامن لە توشکردنی زۆربەی کیشوەرەکە، ڕوونکردنەوە بۆ کۆلێراش دەدات: هەر لە ساڵانی دەیەی ۱۹۷۰، نەبوونی ژێرخانی تەندروستی و ئابووریەکی زیاتر و زیاتر شلۆق، گەشەسەندنی نایەکسان و لاوازی دروستی هەموویان لێکدەرەوەی مانەوەی دەسەڵاتی کۆلێران. کۆچی پەیوەندیدار بە جەنگی دانیشتوان یارمەتی بڵاوبوونەوەی کۆلێرایان داوە.

حەوتەمین پانەپەتا بە گشتی زۆر جیاوازبووە لە شەشی پێشوو. ئەو کار دەکاتە سەر ناوچە نوێیەکان یان ئەو ناوچانەی کە لە ماوەیەکی زۆردا هیچیان بەرنەکەوتووە، وەک یەکێتی سۆڤیێتی پێشوو و ئەمریکای لاتین؛ هەروەها زۆر بە خێرایی گەشتی کردووە، ئەوە درێژتر لە هەر پانەپەتایەکی پێشوو ماوەتەوە و چل ساڵ بە بەهێزی دەڕوات و هیچ نیشانەیەکی بۆ ڕۆیشتن لە هیچ شوێنێک نەبووە. ئێل تۆر کەمتر لە کۆلێرای کلاسیکی توندبوو، کە ڕێگە دەدات بە ئاسانتر گەشت بکات.

کۆلێرا، زیاتر لە هەر نەخۆشیەکی تر، بەرهەم و هێمای نایەکسانی کۆمەڵایەتییە. ئەو بەسادەیی بوونی نیە لە ئەو شوێنەی کە ئاوێکی پاک و خاوێنیان هەیە. گۆڕانی کەش و هەوا لەوانەیە ئەمە خراپتربکات، چونکە گەیشتنی کۆلێرا فراوان دەبێت بۆ ئەو شوێنانەی کە زۆرترین کاریگەریان لەسەرە و ناتوانن کاریگەریەکانی بەرزبوونەوەی پلەکانی گەرمای دەریا کەمبکەنەوە، ئەو پلەی گەرمایەی کە کۆلێرا دەتوانێت گەشەی تێدابکات.

# بەشی پێنجەم

# سیل

سیل، توشبوون بە بەکتریای مایکوباکتریا توبرکۆلۆس هۆکارەکەیەتی، لەوانەیە کۆنترین نەخۆشی مرۆڤ بێت. ئەم بەشێکە لە خێزانی نەخۆشی میکۆباکتریەم، لە ئەوانە M.africanum، M.bovis و M.cannetti، کە لەوانەیە بۆ ماوەی سێ سەد ملیۆن ساڵە پەرەی سەندبێت. کۆنترین بەڵگەی بە بەردبوو بۆ نەخۆشیەکی هاوشێوەی سیل لە مرۆڤی هۆمۆ ئیرکتوسی تەمەن پێنج سەد هەزار ساڵەوە دێت کە لە تورکیا دۆزراوەتەوە کە برینی هاوشێوەی سیلی پێوەبووە.

نەخۆشی سیل ئەو جۆرەی کە کاریگەری لەسەر مرۆڤەکان هەیە، نزیکەی حەفتا هەزار ساڵ لەمەوبەر لە ئەفریقا پەیدابوو. هاوەڵی مرۆڤی هاوچەرخ بووە لە ڕێگای کۆچکردنیان بۆ دەرەوەی ئەفریقا، سەرەتا تێپەڕبوون بە زەریای هیندی و دواتر، دوای چەند هەزارەیەک، بۆ نێو ئۆراسیا. سیل گەشایەوە کاتێک خەڵک نیشتەجێبوون و

نزیکەی دە هەزار ساڵ پێش ئێستا دەستیان بە پێکەوە ژیان کرد. ئیتر لە ئەو کاتەوە لەگەڵمانبووە.

نەخۆشـــی سـیل نـــزیکەی هەمـــوو بەشـــەکانی لەش توشـــدەکات، ئێســـکەکان، خـــوێن، مێشـــک. بـــاوترین و کوشندەترین شـێوە، کە لە ڕێگەی دڵۆپە بچووکەکـانی نێو هەوا لە کەسێکەوە بۆ کەسێک دەگوازرێتەوە و زۆر پەرۆکە بـریتیە لە سـیلی سـییەکان. سـیل لە شـوێنە قەرەباڵغەکـان گەشـە دەکـات. سـیل وەک پەتـا، نەخۆشـییەکی دێـرینە و نـزیکەی مـاوەیەکی زۆرە دەربـارەی نووسـراوە. هەروەهـا بـاس لە سـیل کـراوە لە ڕووی درم و هەڵاوی بـۆگەنی، لەبەرئەوە دەستنیشانکردنی نەخۆشیەکە لە مێژوودا قورسە.

سیل دەتوانێت وەک هەوکردنی سییەکان یان نەخۆشیە هەناسەییەکانی تر دەربکەوێت. وەسفی نیشانەکانی لە سەدە کۆنەکـان بریتیبـوو لە ئـارەقەی شـەوانە، دابەزینـی کـێش، کـۆخەی وشـک، کە دەستنیشـانکردنی یەکـلاکەرەوەی نەخۆشـییەکە قـورس دەکـات. سـیل ئەو نەخۆشـیەبوو کە فەرمـــووی لە شۆڕشـــی تـــاقیگەیی کـــرد، چـــونکە ئەوە مایکۆباکتریـا بـوو کە ببـووە هـۆی ئەو نەخۆشـییەی کە ڕۆبێـرت کـۆخ لە سـالی ١٨٨٢ لە ژێـر وردبینـی خۆیـدا دۆزییەوە. نەخۆشیەک کە ڕۆژانێک بە دەردە باریکە و دیق ناسـراوبوو، لەگەڵ هۆکـاری نەزانـراو و بێشـومار بـوو بە نەخۆشـیەکی تـاک کە سـیلە لەگەڵ تـاکە هۆکارێـک کە مایکۆبەکتریایە.

سـیل لەناکـاو پەیـدانەبووە کە ژیـانی لە ملیۆنەهـا کەس سەندبێت وەک تاعوون؛ بەڵکو بە هێواشی کاری دەکرد. هیچ کەس بیـری لێنەکـردۆتەوە وەک توڕەبـوونی یەزدان، کە ئاسـمانیانە نـاردبێتی بـۆ بەزانـدنی گونـاە و گوناهکـاران.

جیاواز لە کۆلێرا، نیشانەکانی بە تایبەت پەرێشانکەرنین. کەس لەناکاو لەگەڵ سیل دەسەپاچ نابێت، مردوو یان زیندوو ببێت لە ماوەی چەند کاتژمێرێک تەنها دوای ڕژانی بەکتریاکە بۆ نێو شلەکانی لەش. نەخێر؛ سیل بە شێوەیەکی نادیار کاردەکات، و لە سەرەتادا نەبینراوە.

سیل ڕاگەیاندن و بۆچوونی گشتی نەوروژاند وەک کۆلێرا لە سەدەی نۆزدەدا کردی، نە خەڵکی بۆ ڕەشەکوژ کردنی ئەوانی تر بزواند وەک تاعوون کردی، بەڵام سیل بەرپرسیاربوو لە مردنی زۆر زیاتر لە هەر کام لە ئەو نەخۆشییانە.ئەوەندە زوو وەک لە سەدەی حەڤدە، وەفاتنامەکان، تۆمارە سەرەتاییەکانی پەتاناسی لە لەندەن، ئاماژە بە ئەوە دەکەن کە ٢٠٪ مردنەکان لە شارەکە بەهۆی دەردەباریکەوە بووە. ئەو ڕێگایانەی کە خەڵک لە کاتی خۆی لێی تێگەشتبوون لە سیل زۆر جیاوازبوون لە ئەوەی کە ئێستا لێی تێگەیشتوون.

پەرتووکە گشتگیرەکەی ڕیچارد مۆرتۆن Phthisiologia، سەرەتا بە لاتینی و پاشان بە زمانی ئینگلیزی لە کۆتایی سەدەی حەڤدە بڵاوبووەوە، کە دەردەباریکەی بە هەموو شێوەکانییەوە باسکردبوو. بۆ نموونە، بۆ مۆرتۆن سیل بە شێوەی جۆراوجۆر لەوانەیە ڕوویدات کاتێک خەڵک نینۆکان قوتدەدەن یان سیەکانیان کوندەبێت یان کاتێک ژنان شیری زۆر دەدەن و خوێن دەڕژێتە نێوی، ئەمەش دەبێتە هۆی بارودۆخی لاوازبوون و خاوخلیچکی. لە کاتێکدا ئەمانە وەک سیلی هاوچەرخنین، کاتێک مۆرتۆن باسی گرێکان دەکات، ئەو ئاوسانە گرێییانە لە سییەکان، وەسفکردنەکەی زۆر لە ئەو نەخۆشییە دەچێت کە ئێستا پێی دەڵێن سیل.

تۆماس سیدنهام پێیوابوو گەشتە درێژەکان لەسەر ئەسپەکان باشترین دەرمانن. بەدرێژایی سەدەی هەژدە، وەسفەکانی سیل زیاتر و زیاتر دیاریکراوبوون. توێکارە ئیتاڵی و بەریتانیەکان گرێی سیلیان لە سەرجەم بەشەکانی لەش ئاشکراکرد. وەسفە لێڵەکان لە سەرەتای سەدەی نۆزدەدا بەرەو کەمبوونەوە چوون، دوای ئەوەی ڕێنی لاینێک هەموو وەسفە نەخۆشیەکانی سیلی یەکخستەوە و پاشان دەستاودەستی پێکرد.ئەو، نووسیبووی، بەبێ گرێی سیل، سیل بوونی نەبوو. ئەوەی لێ ڕوانینەکانی کردەنی کرد ئەو ئامێرەبوو کە دایهێنا بۆ گوێگرتن لە ناوەوەی جەستە، بیستۆکی پزیشکی. لە کاتێکدا پێشتر پزیشک نەخۆشی سیلی دەستنیشاندەکرد تەنها بە گوێگرتن لە سەرگوزشتەی تەخۆشیەکە و چاودێریکردنی نیشانەکان، لاینێک ڕاستەوخۆ گرێ سیلییەکانی دەستنیشانکرد، بە بیستۆکی پزیشکی خۆی و دوای مردنی نەخۆشەکە بە توێکاری کردن. ڕێبازێکی ڕوون هەبوو لە نێوان بیستۆکی پزیشکی لاینێک و وردبینەکەی کۆخ. سەرەتا لەگەڵ لاینێک و پزیشکەکانی تری پاریس کە سەرنجیان لەسەر نەخۆشیە تاک زیندوەرەکان بوو، سیل لە ساڵی ١٨٣٩ وەک نەخۆشیەکی تاک زیندەوەر سەرنجەدرا.

سیل، ناوەکەی، بەدەستهێنا کاتێک پرۆفیسۆری سویسری پزیشکی جەی ئێل سکوینلین هەموو ئەو نەخۆشیانەی کە سەلکۆکەیان هەبوو لە ژێر ئەو ناونیشانەدا یەکخست، کوخیش هەموو ئەمانەی سەلماند بە وردبینەکەی لە ساڵی ١٨٨٢. هەر چەندە سرووشی هەمان جۆر ترس یان تۆقین لە بێگانەی نەکرد وەک کۆلێرا، بەڵام سیل بوو بە بابەتی وێژەیی و شانۆی میوزیکی (بە ناوبانگترینیان ڤێردی لا بۆهێم) و شاعیری دڵداریی توبرکلۆسیل (کیاتسی شاعیر

به ئاسانی دێته مێشکەوە) بۆ ماوەیەک لە سەدەی نۆزدە لە کەلتووری ئەورووپا شوێنێکی نامۆی داگیرکرد. جوانی مێینەی پلە باڵا لە شێوەی ئافرەتێکی کاڵ و سیس کە بە دەگمەن خۆری ببینێت و مانەوەی درێژ لە نێو ماڵدا پەسەند بکات، لێکنەچوو نەبووە لە ژنێکی سیلاوی: کاڵ و باریک و لاواز.هەر کە سیل پێگەیەکی دیارتری لە ڕێژەی مردنی ئەورووپی بەدەستهێنا، شوێنێکی دیارتری لە بوارە جۆراوجۆرەکانی کەلتووردا داگیرکرد. بە دڵداریی کردنی نەخۆشی سیل تەنها شتێکی بچووک و کورت تەمەنبوو، تایبەتمەندی مێژووی نەخۆشیەکە، داپۆشراوە بە کاریگەریە زۆرەکانی لەسەر ژیانی ئەو کەسانەی کە بە زۆری توشبوون؛ هەژارانی شارنشین.

هێشتا، وێنەکانی شاعیری دڵدار کە لە لایەن سیل یان ئەو ژنە زەرد هەڵگەڕاوەی کە لەسەر ڕوو پاڵکەوتووە لە جێگەی نووستنی، دەسەڵاتی مانەوەی بەرچاویان هەبوو. سیل بە گشتی شوێنێکی گەورەتری لە فەرهەنگ گرت و دیارترین ئەقڵە پزیشکیەکانی سەدەی نۆزدەی داگیرکرد، چونکە بە توندی خۆی لە دەسەڵاتی گشتی جێگیر کردبوو. ئەو گەورەترین بکوژی سەدەی نۆزدە بوو و بە خێرایی زیادیکرد لەگەڵ پەرەسەندنی پیشەسازی و گەشەی شارە قەرەباڵغ و نادروستەکانی وەک پاریس و لەندەن. مارکس و ئینگڵس لە ساڵی ١٨٦٢ لەم بارەیەوە نووسییان "دەردەباریکە و نەخۆشییەکانی تری سییەکان لە نێوان خەڵکی کرێکار مەرجی پێویستن بۆ بوونی سەرمایە." پیشەسازی و شارنشینی و سیل ئەوندە ئاڵۆزکاوبوون کە تا ساڵانی دەیەی ١٩٣٠ ئەمانە وەک هەنگاوی پێویست لەسەر ڕێگای وڵاتێک بۆ هاوچەرخبوون سەیردەکران.

له کاتێکدا که سیل له ئەفریقا و هیندستان تەنها پێش جەنگی جیهانی دووەم زیادیکرد، بۆیە ئەوە هات که به نەخۆشی شارستانی ناوببرێت. له کۆتاییەکانی سالانی دەیەی ۱۹۳۰، لایل کامینس، پسپۆڕی سیلی بەریتانی و شرۆڤەکاری بەردەوامی ئەو نەخۆشیە له ناوچە داگیرکراوەکان نووسیبووی که هیندستان ئەو کاتە وەکو ئینگلستان بوو له کاتی داهێنانی "تەشی جێنی". چارلس ویلکۆکس، پزیشکێکی بەریتانی بوو که شارەزاییەکی بەرچاوی له ڕۆژهەلاتی ئەفریقا هەبوو، زایەڵەی مارکس و ئینگلسی دا کاتێک نووسی بووی، له زیادبوونی ڕێژەی سیل له ناوەندەکانی شارنشینی ڕۆژهەلاتی ئەفریقا، که "گرنگییەکی کەم به کەرامەتی مرۆڤ دەدرێت له ئەو ژیانەی که ئەم بارودۆخانە دەهێنێتەئاراوە، و پیاوان ئەوەندە وەک یەکەی بەرهەمهێنانن ئەوەندە وەک مرۆڤ نین" سیل بووە سیمبۆلی بارودۆخی سەختی هاوچەرخبوون، که نمایندەی دەکرا به زۆربوونی خێرایی شارنشینی و پیشەسازی و دروستکردنی چینی کرێکار.

ئەوەی له جیهانی تازە پێشکەوتووی سەدەی بیستدا ڕوویدا؛ له ئەوروپا له سەدەی نۆزدە ڕوویدابوو. تۆماری مردووان گرانە پەیدابێت، بەلام وا دیارە که سیل هۆکاری سەرەکی مردنی ئەوروپا بووبێت. له ئەوروپای ڕۆژئاوا له ماوەی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەدا ڕێژەی مردنی له ۳۰۰ بۆ ۵۰۰ کەس له هەر ۱۰۰،۰۰۰ کەسبوو. هەر بۆ بەراوردکردن، ئەمڕۆ له ویلایەتە یەکگرتووەکان ئەو ژمارەیە نزیکەی ۰.۱ کەسە له هەر ۱۰۰،۰۰۰ کەسێک.

سیل دەستیکرد بە وەرگرتنی باجی پیشەسازی یەکەم لە ئینگلستان، کە بڵاوەپەتایەک دانیشتوانی چینی کرێکاری وێرانکرد لە کۆتایی سەدەی هەژدەوە تا ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە، لە ئەو کاتەوە لە ئینگلستان و وێڵز سیل بە شێوەیەکی ئاسایی داوای گیانی پەنجا هەزار کەسی لە ساڵێکدا دەکرد، کە لە خراپترین ساڵیدا کۆلێرا چل هەزاری کوشت.




٦. ڕەوشی پەرپوتی شارەکانی ئەورووپا هۆکابوو بۆ بڵاوبوونەوەی سیل، ئەم پۆستەرەی ساڵی ١٩١٧ دیمەنی شەقامێکی ناوچەیەکی هەژانشینی پاریس پیشاندەدات. درویێنەکەری ژیان شەبەنگ دەدات لە پشتەوەی دیمەنەکە.

له کاتێکدا ڕاسته که دوای نزیکەی ١٨٥٠ سیل دەستی به دابەزینی سەد ساڵەیی کرد، ئەمه مانای ئەوه نییه چینی هەژار و کرێکار هێشتا به سیلەوه نا ناڵێنن. ئەوان بەرێژەیەکی زۆر نابەرامبەر توشدەبوون. کاتێک دەستکرا به پاراستنی تۆمارەکان، ئەوەی له خۆیانیان دەگرت تەنها ڕووکار بوون. پشکنینەکانی پاش مەرگ له سالانی دەیەی ١٨٨٠ له نەخۆشخانەی لەندەن بۆ مندالانی نەخۆش ئەوەی دەرخست که سیل بەنزیکەیی بەرپرسیاربووه له ٤٠٪ مردنەکان؛ ٨٠٪ ئەم مندالانه له چینی کرێکاربوون.

هەمان شت له شاری ئیندینبەر ڕاستبوو: ٣٩٪ مردنەکان له نەخۆشخانەی شاهانه بۆ مندالانی نەخۆش به هۆی سیل؛ ٩٨٪ ئەو مندالانه لەسەر هاوکاری گشتی دەژیان. کاریگەری نەخۆشییەکه له ئینگلستان ئەوەنده گەورەبوو به جۆرێک کاتێک دەستیکرد به دابەزین، بەدوایدا ڕێژەی مردنیش به گشتی دابەزی. کاتێک کەسێک سەیری فەرەنسا، ئەڵمانیا، ڕووسیا، یان ئەمریکا دەکات، مرۆڤ شێوازی هاوشێوه دەبینێت: پەرەدان به پیشەسازی هاوەڵبوو لەگەڵ سیلی زیاتر و زیاتر. له سالانی دەیەی ١٨٥٠، له شارەکانی وەک بالتیمۆر، فیلادلفیا، نیو ئۆرلیانس، و ئەتلانتا، سیل بەرپرسیاربوو له ڕێژەی نێوان ١٥٪ بۆ ٣٠٪ی هەموو مردنەکان. هەروەک له زۆربەی ئەوروپا، هەروەها له ئەمریکاش سیل هۆکاری سەرەکی مردن بوو. هاوکات وەک ئینگلستان و وێلز، سیل دەستیکرد به دابەزین نزیکەی له ناوەڕاستی سەدەکە. بەلام دابەزینەکە نارێکبوو: به پێی

شـــوێن و چینـــی کـــۆمەڵایەتی جیـــاوازبوو، هەروەهـــا بە نابەرامبەرانە کاریگەری لەسەر کەمە نەتەوەییەکان هەبوو.

لە ســـەرەتای بەهـــاری ســـاڵی ١٨٨٢ ڕۆبێـــرت کـــۆخ لە بەرلین قسەیەکی کرد کە دنیای پزیشکی سەرسامکرد. ئەو گەورەترین بکوژی سەدەکەی دەستنیشان کردبوو، کە نـاوی نا چیلکەی سیل tubercle bacillus. گرنگی کاری کۆخ، و کاریگەری لەسەر پزیشکی و تەندروستی گشتی، ناتوانرێت زیاد لە ئاستی خۆی گەورە بکرێت. لە ئەو کاتەوە سیل کە یەک هۆکـــاری هەبـــوو. بە تێپەڕبـــوونی کـــات، تیشـــک خستنەســـەری توندی بەکتریـــا چیلکەییەکـــان کەم بـــووەوە، ئەگەر نکـــۆڵی لێنەکردرابێـــت، گرنگـــی هەمەجـــۆری هۆکـــارە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی هۆکاری بڵاوبوونەوەی سـیل بوو لە نێوان هەندێک لە دانیشتوان و هەندێکی دیکە نا.

ئەو بیـرۆکەیەی کە سـیل لە لایەن تـاکە زینـدەوەرێکەوە دروســتبووە بەکتاریـــای چیلکەیـــیە، بە شـــەو و ڕۆژێـــک لە هەموو شوێنێک وەرنەگیرا، هەروەها لە کۆتاییدا پشـووی بۆ مشـــتومڕی نێـــوان درم و دژە درمەکـــان نەهێنـــا. ئـــارپەر ڕانسۆم، بۆ نموونە، نموونەیەکی دیاری ئەو کەسانە بـوو کە هێشتا پەیوەستبوون بە ئەو تێڕوانینەی کە نەخۆشیەکان لە نێـــــوان خەڵکـــــدا تێپەڕنـــــابن. ئەو لە ســــــاڵی ١٨٨٧ لە پەرتووکی Transactions of the Epidemiological Society دەنووســێت، ڕانســـۆم ئەوەی پێشکەشـکرد کە بە بۆچـونی خـۆی حـاڵەتێکی بەهێـزە کە تێیـدا خـاک هۆکـاری سیلە.

ئەگەر چی ڕانسـۆم بـاوەڕی بە چیلکەکە هەبوو، بـۆ ئەو ســیل، وەک کـۆلێرا، لە شــوێنە دیاریکراوەکانـدا ڕوویــداوە؛

کەواتە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر نەپەڕیوە، ڕانسۆم سیلی دەدایە پاڵ هەڵاوی بۆگەن: "پێدەچێت زۆر ئەگەری هەبێت، لە ڕاستیدا، بۆ بڵاوبوونەوەی چالاکانەی نەخۆشییەکە، دەبێت هەندێک زیادبوون لە توندی وردە زیندەوەرەکە ڕووبدات لە دەرەوەی لاشە، ئەم توندبوونی هێزە بە زۆری بە بوونی مادەی ئەندامی گیانەوەری لە هەوادا پەیدادەبێت، بە واتایەکی تر، بە نەبوونی هەوا گۆڕکێی کارا. هەروەها کاریگەری خوازراوی شێداری ژێر خاکی بۆ وردە زیندەوەرەکە زۆر ئاشکرایە" هەر چۆنێک بێت، تا سەرەتای سەدەی بیست زۆرینەی خەڵکی سیلیان بە درم دەزانی و لە شاری نیۆیۆرک، لە ساڵی ١٨٩٧ و لە ژێر دەسەڵاتی بریکاری تەندروستی هێرمان بیگز سیل بوو بە "نەخۆشییەکی درم و گوێزراوە" هەروەها سیستەمی ئاگادارکردنەوەی ناچاری دانرا. هەندێک لە ویلایەتەکان ناردنە نەخۆشخانەی زۆرەملێیان دەستپێکرد، کە هەنگاوێک بوو هەندێک تەماشیان دەکرد بە دەستدرێژیکردن بۆ سەر ئازادی تاک بۆ سوودی گشتی.

دۆزینەوەی هۆکاری سیل بووە هۆی ئاهەنگ گێڕان و پێشبینیە لە ئەندازەبەدەرە متمانەدارەکان. ڕۆژنامەی تایمزی لەندەن دڵخۆشبوو بە ئەو ئەگەرەی کە "بە هەزاران ژیانی مرۆڤ کە ئێستا هەموو ساڵێک قوربانی ئەو نەخۆشیانەن کە بەکتریا چیلکەییەکان بەرهەمیان هێناوە، لەوانەیە زۆر دوورنەبن بۆ پاراستنیان لە دژی ئەو دوژمنە سامناکە" بووە هەرایەکی گەورەی نێودەوڵەتی، ئەمەش کەمتر لە دە ساڵ دوای دۆزینەوەی بەکتریای چیلکەیی، کۆخ پێی وابوو کە چارەسەری دۆزیوەتەوە. بەڵام سیلین، دەرهێنراوێکی

بەکتریای چیلکەیی لە لەشی کەسی توشبوو کە کۆخ هیوای دەخواست وەک پێشگیرکەرێک لە توشبوون کاربکات، دەرکەوت کە بێسوودە وەک چارەسەر (هەر چەندە زۆر کاریگەرە وەک ئامرازی دەسنیشانکردنی سیل). زانینی هۆکارەکە، دەرکەوت، تەنها بەشێکبوو لە چارەسەر بۆ کێشەکە نەک هەموو یان تەواوی چارەسەر.

چارەسەرەکان بۆ کێشەی سیل بریتیبوون لە هەڵمەتەکان بۆ قەدەغەکردنی تفکردن و هەوڵدان بۆ دروستکردنی خانووی گونجاوتر. یەکێک لە چارەسەرە بەناوبانگەکان و بەربڵاوەکان و کەمترین کاریگەرەکان ئاسایشگای سیل بوو.

بەشێک لە هۆکاری دامەزراندنی یەکەم ئاسایشگای سیل، لە چیاکانی سیلسیا، ئەو باوەڕەبوو کە سیل لە سەرووی چەند بەرزاییەکی دیاریکراوەوە ڕووی نەداوە. سەرەتا لە ساڵی ١٨٥٩ لە ئەڵمانیا دەرکەوت و دواتر بڵاوبووەوە بۆ دەوروبەری باکووری ئەوروپا، شێتگیری ئاسایشگاکان لە دەورووبەری چەرخی سەدەی بیستدا هات بۆ ویلایەتە یەکگرتووەکان، کە ئەندازەکرابوو بۆ پێدانی نەخۆش و دووربوون لە ژیانی سەرقاڵی شارەکان و ڕێگەدان بە هەڵمژینی هەوای سازگاری وڵات، هیوا دەخوازرا کە ئاسایشگاکان، کات بە نەخۆشەکان بدات بۆ چاکبوونەوە. نەبوونی هیچ چارەسەرێکی ڕاستەقینە، هیچ دەرمان و پێکوتەیەک بوونی نەبوو بە جۆرێک لە جۆرەکان ئاسیشگاکان تێڕوانینی پێش کۆخیان بۆ نەخۆشییەکە گەڕانەوە: خەڵکیان لە ژینگەی سیلاوی دەرکردووە و خستوویانەتە شوێنێکی دروستەوە.

تێگەشتنەکان دەربارەی بەرزایی و سیل گۆڕان، بەڵام پێداگری لەسەر ژیانی دروست لە دەرەوە نەگۆڕا. لە ئەمریکا، چارەسەر بۆ سیل، کە لە کتێبەکانی وەک لاوراسن براون Rules for Recovery from Pulmonary Tuberculosis 1916 و ئیس. ئادۆلفس نۆف لە ساڵی ١٨٩٩ Tuberculosis as a Disease of the Masses and How to Combat پێشنیاردەکرا ئەوە بوو کە پێیان دەگوت ژیان لە دەرەوە. ئێدوارد ترۆدۆ زۆر بە سەختی "ژیانی دەرەوەی" پەیڕەوکرد لە ئاسایشگا لە دەریاچەی سەراناک، نیویۆرک، کە نەخۆشەکان بویربوون لە بەرەنگاربوونەوە زستانە سەختەکان بە مانەوە لە دەرەوە بە ئەو هیوایەی کە هەوای سازگار سیل لە سییەکانیان دەربکات هەر چەندە پەیوەندی نێوان هەوای ساردی سازگار و چارەسەری سیل ناڕوونبوو، تەنانەت بۆ دیارترین پاڵپشتیکارانی، ئاسایشگای ترودۆ سەرکەوتنێکی گەورەی سەلماند: خەڵک لە هەموو شوێنێکەوە هاتن بۆ گەڕان بەدوای چارەسەری سیل. خێرخوازن پارەیان بۆ هەژاران دابیندەکرد، دەوڵەمەندەکان کوخی خۆیان دروستکرد. ئاسایشگای ترۆدۆ تایبەتبوو، بەڵام ئەوانی تر گشتیبوون.

حکومەت و دەوڵەتەکان یان شارەوانی، بۆ هیندیە ئەمریکیەکان حکومەتی فیدراڵی ئاسایشگاکانیان بەڕێوەدەبرد، لە شانشینی یەکگرتوو و بەشێکی زۆری ڕۆژئاوای ئەورووپاش لە لایەن دەوڵەتەوە بەڕێوەدەبران. زۆرێک لە ئەوان دەوروبەری دەشتاییان نەبوو کە لە دەریاچەی سەراناک هەبوو، بەڵام هەموویان جەختیان

لەسەر پشوو و خۆراکی باش و کاتێکی زۆر لە دەرەوە دەکردەوە.هەوڵی تر هەبوو لە دۆزینەوەی چارەسەر. چارەسەری ئاسایشگا لە بنەڕەتدا کارێکی نەبزێوبوو: کە بە زۆری بۆ پشوودانبوو. چارەسەرەکانی نەشتەرگەری زۆر جیاوازتر نەبوون. باوترین چارەسەر بۆ سیلی سییەکان چارەسەری تێکشکاندن بوو، یان کونکردنی دەستکردی سییەکان، کە سییەکانی خاڵی دەکرد و ڕێگەی پێدەدا پشووبدەن و چاکببنەوە.وەک ئیسمۆند لۆنگ پسپۆڕی ئەمریکی سیل لە ساڵی ١٩١٩ نووسیویەتی "بیردۆزی کونکردنی دەستکردی سی بە ئەندازەی پێویست سادەیە... (ئەوە) هەر وەک ئەوەی پێشوو پشوو، یان پاڵکەوتن وایە_ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، لە پاڵدانەوە و "کورسی چارەسەر" پشووی ناچاری_ پشووی دەسەپاند بەسەر بەشە چاکبووەکە (سییەکان). لە کاتێکدا لۆنگ دوودڵ بوو لە ئەوەی "زۆر بە قووڵی بچێتە نێو ئامارەکانەوە"، بەڵگە سەرگوزەشتەییەکان پێشنیاری ئەوەیانکرد کە کونکردن کاری کرد لە ئەو شتەی کە پێی دەوترێت "حاڵەتی نەخۆشیی بێ هیوا" ئەو ڕاییکاریە بە دڵنیاییەوە هەندێک کاریگەری ئەرێنی هەبوو لە حاڵەتەکانی تاکدا، بەڵام وەک ماددەیەکی تەندروستی گشتی کونکردنی دەستکردی سیی، یان ئاسایشگا چارەسەرێک نەبوو بۆ کێشەی سیل.

هیچ کام لە ئەو ڕێوشوێنانە، چەند بەناوبانگن و چەند لە هەندێک حاڵەتدا کاریگەریان هەبووە، بەڵام هیچ کاریگەرییەکیان لەسەر تەندروستی گشتی نەبووە. تەنانەت کاتێک کاریگەریان هەبوو، هەرگیز خزمەتی ژمارەی پێویست خەڵکیان نەکردووە.

سیل بە شێوەیەکی بەرچاو لە سەرتاسەری جیهانی پێشکەوتوودا دابەزی، بە تایبەتی لە ئەمریکا و بەریتانیای گەورە، لە نێوان ناوەڕاستی سەدەی نۆزدە و سەردەمی دژە زیندەییەکان، سوپاسەکە بۆ ڕێکاری تەندروستی گشتی دیاریکراو و پێوانەیی باشترکراوی ژیانە.

سەرەڕای ئەوەی بۆ نموونە بەشی تەندروستی گشتی نوێ لە شارەکانی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەی نەخۆشی سیل پێکهێنرا، بەڵام هیچ هۆکارێک ناتوانێت کەمکردنەوەی گشتی سیل لە دانیشتوانی گشتی ڕوون بکاتەوە. جیاکردنەوەی حاڵەتەکانی توشبوو بە نەخۆشی گوێزراوە لە شوێنی مانەوەی کرێکاران لە بەریتانیا سێلی لە دانیشتوانی گشتی کەمکردەوە. بە کەمکردنەوەی مەترسی توشبوون. هەمان شت لە نیویۆرک ڕاستبوو: دیاریکردن و جیاکردنەوەی حاڵەتی توشبوو بە نەخۆشی گوێزراوە لە لایەن بەشی تەندروستی گشتی تازە پێکهێنراوەوە ڕێگەیدا بۆ لابردنیان لە دانیشتوانی گشتی بۆ نەخۆشخانەکانی سیل.

بە ئەم شێوەیە توشبوون کەم دەکاتەوە و لە هەمان ڕێگەوە ئاسایشگاکان هەمان کاریگەریان هەبوو. کەمکردنەوەی مەترسی بڵاوبوونەوەی توشبوون زۆر گرنگبووە لە ڕابردوو و لە ئێستاش بۆ وەستاندنی سیل. بەڵام سەرچاوە پێویستەکان بۆ ئەو کارە تەنها لە ئەو شوێنانەدا بەردەست بوون کە پێوانەی ژیان بەرزببووەوە. نەبوونی باری باشتربوونی ژیان هاوەڵبوو لەگەڵ نەتوانین لە کەمکردنەوەی توشبوون بە نەخۆشی گوێزراوەکان.

سـيل بە نەخۆشـی هەژاران مـايەوە. لە نيويـۆرک، دانيشـتوانێکی گەورەی کـۆچبەر لە باڵەخـانەی قەرەبـاڵغ کە هەوا گـۆڕکێ خراپبـوو، نيشـتەجێبوون. ڕێـژەی سـيل لەوێ لەچـاو گەڕەکە باشـەکان زۆر زيـاتربوون. لە سـاڵی ١٨٩٠، بەشـی ڕۆژئـاوای سـەرووی مانهاتـان ٤٩ حـاڵەتی هەبـوو لە هەر ١٠٠،٠٠٠ لە مانهاتـانی خـواروو، کە ژمـارەيەکی زۆر کـۆچبەری تێـدا دەژيـا، ڕێـژەکە ٧٧٦ بـوو لە هەر ١٠٠،٠٠٠ کەس.لە نێـوان دوو جەنـگەکە، مردنـی منـداڵانی ئەفريقـی ئەمريکی لە خوار پێنج ساڵ ٣٧٤٪ ئەوەندە بەرزتربوو لە منـداڵانی سـپی پێسـت. لە نێـوان ئەمـريکيە ئەفريقيەکـان لە شـوێنەکانی وەک بـالتيمۆر، نە توشـبوون کەمبـووەوە و نە پێـوەری ژيـان بەرزبـووەوە وەک ئەوەی کە بـۆ زۆربەی کەرتەکانی دانيشـتوانی سپی پێست هەبوو. لە ساڵی ١٩٣٠ لێکـۆڵينەوەيەکی ئامـاريی دەزگـای کاروبـاری هينـدی بـۆی دەرکەوت کە لە باشووری ڕۆژئاوا نزيکەی ٧٥٪ دانيشـتوانی ڕەسەنی ئەمەريکا تووشی سيل بوون.

سـەدا سـەدی هـۆزی ڕەسـەنی پيمـاس لە بيسـت تـاقيکردنەوە ئەرێنـی بـوون. لە ساسـکاچوان ٢٩٪ هەمـوو مردنی هينديەکان بەهۆی سيلەوە بوون. نەخۆشی سيل هيچ نيشـانەيەکی کەمبـوونەوەی لە نێـوان دانيشـتوانە پەراوێزخراوەکـان لە ئەمريکـا پـێش دۆزيـنەوەی دژە زينـدەييەکان پيشـاننەدا. بەڵام کاتێـک تـاقيگەی سـلمان واکسـمان لە سـاڵی ١٩٤٤ دژە زينـدەيی Streptomicine دۆزيەوە و مـژدەی سـەردەمی دژە زينـدەيی هێنـا، وەک ئەوەی کە پەرچـوويەک ڕوويـدابێت: نەخۆشـييەکی زل، بـێ دووژمنێکی شايستە ئێستا بە گون ڕەشەکەی گەيشتووە.

هەر چۆنێـــک بێـــت، لە نێـــو دانیشـــتوانی گشـــتی دەژ زیندەییەکان ئەوانەیان کوشت کە پێشتر خەریکبوو دەمـردن. لە کاتێکـــدا کە ســـیل لە دانیشـــتوانی گشـــتی لە جیهـــانی پێشکەوتوو دابەزی، لە شوێنانی تر زیادیکرد. لێکوڵینەوەکـان لە زۆر شـوێندا لە نێوان ماوریەکـان لە نیوزیلانـد و هینـدی ئەمریکـی و نەتەوە ڕەسـەنەکان لە ئەمەریکـا و کەنەدا و لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقا و ئەفریقای باشوور ڕێژەی نیگەرانکەری زۆر بەرزی سیلیان ئاشکرا کرد. تـا جەنگی جیهانی دووەم، بە وتەی بەرپرســـانی تەندروســـتی لە کینیـــا؛ ســـیل بـــووە هۆکاری سەرەکی مردن لە نیشینگەکە. هێنانی ژمـارەی ورد گرانبـــوو، بەڵام کـــاری لێکـــۆڵینەوە، بـــایەخێکی زۆر بە کـــــۆکردنەوەی زانیـــــاری تەندروســـــتی و بەڵـــــگە سەرگوزشتەییەکان دا، کە هەموویان ئەوەیـان ڕوونکـردەوە، ســـیل لە زۆربەی ئاســـیا و ئەفریقـــا و لە نێـــو دانیشـــتوانە ڕەسەنەکانی هەر دوو کیشوەری ئەمریکا لە زیادبووندایە.

بـــۆ مـــاوەیەک، کۆمەڵێـک لێکـدانەوەی نەژادی زاڵبـــوون بەسەر مشتومڕەکە لەسـەر ئەوەی بۆچی سـیل زیاددەکـات. خەڵک لە بەشـە کەمتر گەشەسـەندووەکەی جیهان_"ڕەگەزە ڕەســـەنەکان"_خاکێکی پـــاکیزەبوون بـــۆ ســـیل. ئەوان بە شێوەیەکی بێ هاوتا نەژادیانە مەترسـی توشبوونیان هەبـوو یـــان ئەوان پێشـــتر "ســـیلاوی" نەبـــوون. ئەفریقیـــای ڕەشـــی باشـوور، هینـدیە ئەمریکییەکـان و ئەمـریکییە ئەفریقییەکـان زۆر جـــار ئامـــانجی ئەم شـــێوازە بیرکـــردنەوەیە بـــوون. لە هیندسـتان لێکدانەوە نەژادیەکـان بـازاڕێکی کەمیـان هەبـوو، بەڵام بیرۆکە پەرەسەندووەکان سەبارەت بە شارستانیەت و پێشکەوتن کە هۆکاربن بۆ نەخۆشی بازاڕیان گەرمبوو. لە

ساڵی ١٩٣٣ نوێنەری تەندروستی گشتی بۆمبای بۆچوونی دەربارەی باوەڕییەکی بەربڵاو سەبارەت بە هاوچەرخبوون و بە پیشەسازی بوون و بە شارنشینیبوون لە هیندستان دەربڕی:

(دەوترێت زۆربەی وڵاتانی ڕۆژئاوا پێشتر بە قۆناغی بڵاوەپەتا تێپەڕبوون. بەڵام ئەوە گرانە کە بە تەواوەتی دیاری بکرێت ئێستا نەخۆشییەکە لە چ قۆناغێکدایە لە هیندستان. هەندێک دەڵێن کە هێشتا نەگەشتۆتە لوتکە، ئەم تێڕوانینەی دەڵێت کە هیندستان هێشتا لە قۆناغی سەرەتاییدایە و ئەو ڕادەی سیلاوی بوونەی دانیشتوانی هیندستان لە نیوەی ڕێگەیە لە نێوان نەتەوە ئەفریقییەکان و نەتەوە ئەوروپییە زۆر پیشەسازی و شارستانیەکان، لەوانەیە ڕاست بێت یان ڕاست نەبێت. بەڵام ڕاستیەکە ئەوەیە کە نەخۆشیەکە بەڵایە).

بیرۆکە ڕەگەزیەکان بەهێزبوون، بەڵام شیانی بەدرۆخستنەوە بوون. لە کۆتایی ساڵانی دەیەی ١٩٣٠، کە زانیاری زیاتر و زیاتر بەردەستبوو، ئەو بیرۆکانە دەستیانکرد بە وردوخاشبوون.

لە تانگانیکا، چارلس ویلکۆکس پسپۆڕی بەریتانی سیل لە ڕێگەی لێکۆڵینەوەی فراوانی تیشکی ئێکس دەستنیشانی کرد کە ئەفریقییە ڕەشەکان لە ڕاستیدا هەموویان بەرهەڵستکاری سیلن بەدرێژای کات؛ برینە چاکبووەکان لێکوڵینەوەکەیان دەسەلماند. (تویژینەوەیەکی هاوشێوە لە نێوان هیندیەکانی ئەمەریکادا هاوکات هەمان شتی پیشاندا.) ویلکۆکس دەیزانی کە دۆزینەوەکەی زیاترە لە "بایەخی تیۆریی".

توێژینەوەکەی "زەمینەیەک بۆ هیوای ئەوەی چارەسەری پێویست دەشێت کاریگەربێت، هەروەها گۆڕانکاری لە هەلومەرجی ژیان و پەروەردە کە بابەتی هەموو کارێکی تەندروستی گشتیە، دەتوانێت یارمەتی جڵەوکردنی نەخۆشی سیل بدات" لە ئەنجامی کاری وەک وێڵکۆکس و بەگشتی گۆڕینی بیرۆکەکان دەربارەی نەژاد، لە کۆتایی جەنگی جیهانی دووەمدا زۆربەی کارکەرانی بواری سیل وازیان لە بەستنەوەی نەژادی هێنا. چونکە سیل نەخۆشییەکی هەژاریبوو نەک نەژادی. بەڵام لە کاتێکدا لەوانەیە لێکدانەوە نەژادیەکان بنبڕکرابێتن، بەڵام سیل هەر بنبڕنەکرابوو.

پێش جەنگی جیهانی دووەم بەرەنگاربوونەوە کەم بۆ سیل لە نێو بەشە پەراوێزخراوەکانی جیهان ئەنجامدرابوو. بەڵام دواتر، زۆر بە خێرایی، چەندین پێشکەوتن پێکەوە هاتن بۆ بەرپاکردنی بەرهەمدارترین کات لە جڵەوکردنی سیل کە تا ئێستا جیهان بەخۆوە بینیبووی. پێکهێنانی ئاژانسەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان لە پاش جەنگ وەک ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) و یونسێف بەشێک بوو لە گورزە تەوژمی پاش جەنگ، تەوژم گەلێک کە لە لایەن هاندەری جۆراوجۆری وەک پێشبڕکێی جەنگی سارد بۆ بردنەوەی لایەنگر، مرۆڤدۆستی، و بەرژەوەندی ئابووری لە هێزی کار و بازاڕی بەکاربەری نوێ بۆ پەرەپێدانی ئەوەی کە پێی دەوترێت جیهانی سێیەم. لەگەڵ دۆزینەوەی ئەم دواییەی دژە بەکتریا کە لە ڕاستیدا چارەسەری سیلی دەکرد و ئەنجامە ئەرێنییەکان لە تاقیکردنەوەی گەورەی هیندی ئەمریکی لە سەر پێکوتەی BCG ( bacillus Guérin Calmette) کە ناونراوە بەناوی دوو

زیندەوەرناســـی فەڕەنســـی کە لە ســـاڵی ١٩٠٨ پەرەیـــان بە پێکوتەکەدا. کاتەکە بۆ چارەسەرکردنی سیل لە جیهانی تازە پێشـکەوتوو هـات. لە سـاڵی ١٩٥٣، ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـان(WHO)، ئامـاژەی بە هەڵمەتـی گەورەی پـلان بـۆ دارێـژاوی پێکـوتەی BCG کـرد، هەروەهـا ئامـادەبوو بـۆ ئەوەی پێـی دەوترێـت "گەورەتـرین کـردەی جەمـاوەریی کە جیهان تا ئێستا لە دژی یەک نەخۆشی بەخۆوە بینیویەتی"، تـــا کۆتـــایی ســـاڵانی دەیەی ١٩٥٠ ئەو هەســـتەی کە تەکنەلۆژیای پزیشکی زیندەیی لە کۆتایدا دەتوانێت کێشـەی سیل چارەسەر بکات بەرهەستبوو.

هەروەک لە ســـاڵی ١٩٥٨ ڕێکخـــراوی تەندروســـتی جیهانی(WHO) وتی: "ئەگەرەکان بۆ پەرەپێدانی بەرنـامەی جڵەوکردنـی سـیل لەسـەر بنەمـای ئەو ڕێکـارانەی، کە کاتێک جێبەجێبکرێت بۆ بەرنامەی تەندروستی گشتی، کاریگەری و پەسەندکراوی لە لایەن دانیشتوان بسەلمێنێت و گرانی نرخ نەبێتە ڕێگر بۆ بەکارهێنانی لە ئاستی بەرفراوان، ئەمڕۆ، بۆ یەکەم جار لە مێژوو ئەنجامەکان زۆر گەورەن" دوو توخمی سەرەکی لە ئەم بەرنامەیەدا بریتین لە کوتـان و بەکارهێنـانی دەرمانی دژە سیل."

BCG لە سەرانسەری جیهان ڕێگەی خۆیکردەوە بۆ دە ملیـۆن لاشــە، هەروەهــا دژە بەکتریاکــان بەڵێنــی ســەروو ئاسـاییان پیشـاندا. بەڵام ئالانگـارییەکە زۆر گەورەبوو. هیـوا تێکەڵبوو بە نائومێدی لە جیهانی جڵەوکردنی سیل_نائومێدی لە ڕاپـۆرتە ناکۆکەکـان لەسـەر کـاریگەری BCG و کێشـە جـددیەکان بــۆ کــارکردنی دژە زینــدەییەکان لە جیهــانی ڕاستەقینە وەک ئەوەی لە تاقیکردنەوەکاندا دەیکرد.

تاقیکردنەوەی BCG و دژە زیندەییەکان بوو بە تەوەری زۆربەی کارەکانی ڕێکخراوی WHO و یونیسێف و ئەنجومەنی توێژینەوەی پزیشکی بەریتانیا (MRC)، بەتایبەتی لە هیندستان و کینیا. کوتان بەڵێنێکی گەورەی پیشاندا، چونکە دەبێتە هۆی ڕێگریکردن لە بڵاوبوونەوەی سیل؛ هەروەها دژە زیندەییەکانیش چارەسەریان پێشکەشکرد. بەڵام کاریگەری BCG بە شێوەیەکی بەرچاو فرەچەشنبوو.

ئەو شتەی کە BCG بۆ چەندین دەیە هێشتەوە ئەو هیوایەبوو کە کاربکات و ئەو هەستە زۆر بەهێزەی کە هیچ ڕێگرییەکی تر بوونی نەبوو. دژە بەکتریاکان بێ چەنوچوون کاریانکرد. بەڵام ئەوان زۆر جار لە شوێنانێک بەرهەم دەهێنران کە نەدەتوانرا بە شێوەیەکی کاریگەر بەڕێوە ببرێن؛ پێداویستیەکان بە خاوی دەنێردران؛ هەندێک لە تێکەڵەکانی دەرمان گرانبەها، ژەهەراوی یان قورسبوون بۆ پێدان. ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ئاڵانگاریانە، توێژەرانی WHO و MRC پەرەیان بە ڕژێمی دەرمانی هەرزانتردا و ئەوەیان خستەڕوو کە دەرمان لە خۆدان لەماڵەوە دەکرێت.

بەڵام هەموو ئەو وزە، شارەزایی، و پێشکەوتنانە ناتوانن بەرەنگاری ئەو شتە ببن کە لە هەندێک شوێندا بە جددی هەبووە، لە هەندێک کات کێشەیەکی نەبەز و دڕبووە: بە تایبەت بەرهەڵستی بۆ دەرمان.

لە کەمتر لە دەیەیەکدا، کینیا تا ناوەڕاستی ساڵانی دەیەی ١٩٦٠دا لە هەبوونی هیچ دژە زیندەییەک بە هیچ شێوەیەک، هەنگاوی بۆ ڕووبەڕوبوونەوەی بڵاوەپەتایەکی نزیک جڵەونەکراو لە سیلی بەرهەڵستکار بۆ دەرمان نا.

هەمان شت لە شوێنەکانی تر ڕاستبوو کە دژە زیندەیی هەبوو لە نەبوونی سیستەمی بەڕێوەبردنی کاریگەر. بۆ دەیان ساڵ، WHO و ئەوانی تر کێشەکەیان پشتگوێ خست یان جددیەتیەکەیان بە کەم دەبینی.

هێرشی پاش جەنگی جیهانی یەکەم بۆ سەر سیل چووە پاڵ هەڵمەتی هاوکات بۆ بنبڕکردنی مەلاریا (سەرنەکەوتوو) و ئاوڵە (سەرکەوتوو) وەک چارەسەرێکی تەسکی پزیشکی زیندەیی بۆ جڵەوکردنی نەخۆشی.

بۆ سیل، ئەمە هەرگیز بەس نەبوو. ڕەخنەکانی ئەم ڕێبازە، وەک بزووتنەوەی بەرخۆدانی جەماوەری بەهێز لە دژی هەڵمەتی BCG لە هیندستان لە سالآنی دەیەی ١٩٥٠، زۆر بە دەگمەن بە جددی وەرگیرابوون. لە هیندستان و شوێنەکانی تر، ئەو بیرۆکانەی کە باشترکردنی پێوانەکانی ژیان کلیلی دابەزینی ڕێژەی سیلن هەموویان باشبوون، بەلآم واقعی نەبوون، و زۆرینەیان لە بواری گەشەپێدانی بیری بازرگانیبوون.

ئەوان زۆر زیاتر هاوڕابوون لەگەڵ پسپۆڕی ئەمریکی سیڵ والش مەکدرمۆت کە مشتومڕی ئەوەی دەکرد "بە هۆی پێشڕەویەکانی پزیشکی زیندەیی، سیل نەخۆشییەکە دەکرێت بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە بگۆڕدرێت، بە بێ ئەوەی پێویست بکات چاوەڕێی باشبوونی ژێرخانی کۆمەلآیەتی بکرێت". لە ناوەڕاستی سالآنی دەیەی ١٩٧٠، داهێنان و وزە لە جڵەوکردنی_جیهانی سیل نەما. سیل نەخۆشییەکی فەرامۆشکراوبوو، بەلآم خۆ هەرمابوو. ئەوانەشی کە هێشتا کاریان لەسەر سیل هێشتبووەوە، هەروەها ئەوانەی بەردەوامبوون لە مەترسیی گرتنی،

ڕووبەڕووی گەورەترین بەرەنگاریی بوونەوە: HIV/ئایدز. لەبەرئەوەی HIV سیستەمی بەرگری لاواز دەکات، ئەو هاوڕێیەکی نایاب بوو بۆ سیل. ئەو کەسانە کە HIV ئەرێنین زیاتر لەبەر مەترسی توشبوونن بە نەخۆشی سیل. هەروەها ئایدز زۆر کاریگەرە لە ڕێگەدان بە توشبوونی ناچالاک بۆ بوون بە توشبوونێکی چالاک. لە ساڵی ١٩٨٧ دوو توێژەر نووسیبوویان کە "تێکەڵکردنی هەردوو نەخۆشیەکە دەکرێت هۆکاری هەکاتۆمبێکی ترسناک بێت (قوربانیدان یان کوشتاری چەندین قوربانی) لە ساڵانی هاتنیدا" ئەو کێشەیەی کە لە ساڵی ١٩٩٤دا لەلایەن WHO و یەکێتی نێودەوڵەتی دژ بە سیل و نەخۆشی سییەکان هۆشداریدا، زۆر جددی بوو، کە "بڵاوەپەتای نەخۆشی HIV و سیل ئالانگاریەکی بێ هاوشێوەن بۆ تەندروستی."

سەرەڕای زوو ناسینەوەی پەیوەندی نێوان ئەو دوو نەخۆشیە، بەڵام لە ماوەی سێ دەیەی یەکەمی نەخۆشی HIV زۆر کەم ئەنجامدرا بۆ وەستاندنی شەپۆلی ئایدز/سیل. پسپۆڕی بەناوبانگی سیل و HIV ئانتۆنی هاریس لەگەڵ چەند هاوکارێکی لە ساڵی ٢٠١٠ بروسکەیاندا کە وەڵامدانەوە بۆ نەخۆشی سیل/HIV "شەرمن، هێواش، و نائاهەنگبوو. ئەگەر ئەم دۆخە جەنگ بوایە... هەوڵەکانمان لەبەر نابەدڵی و بێکاریگەریان گاڵتەیان پێ دەکرا." وڵاتانی خوارووی بیابانی گەورەی ئەفریقیا لە هەمووان خراپتر لێیاندرا.

تا ڕادەیەکی زۆر لە ئەنجامی هاوەڵە کوشندەکەی، سیل لە ڕێژەی ١٤٦ بۆ هەر ١٠٠،٠٠٠ لە ساڵی ١٩٩٠ بۆ ٣٤٥ لە هەر ١٠٠،٠٠٠ لە ساڵی ٢٠٠٣ ڕۆیشت. سیل ئێستا بکوژی

ژمارەیەکی زۆر لەو کەسانەیە کە نەخۆشی ئایدزیان هەیە، کە بۆ دەیان ساڵ تێکەڵەیەک لە هۆکارەکان لە پیلاندابوون بۆ ڕێگەدان بە گەشانەوەی جووت پانەپەتاکە: بێگوێی جیهانی بەرامبەر بە سیل تا کۆتایی ساڵانی دەیەی ۱۹۷۰، دەرکەوتنی نەخۆشییەکی نوێ کە کاردەکات لەگەڵ نەخۆشیەکی کۆن، فەرامۆشکردنی زووی ئایدز لە ئەفریقا و بەردەوامبوونی بزرکاوی و نەبوونی سەرکردایەتی لە چارەسەری ئایدزی جیهانی.

کێشەی سیلی بەرهەڵستکار بۆ چەند دەرمان(MDR) کە هەمیشە گەشەی دەکرد زیادبوو بۆ پانەپەتای HIV/سیل، کە زۆر جار وەک بەڵایەکی نوێ ئاماژەی بۆ دەکرا، لە ڕاستیدا بەردەوامبوونی کێشەکەیە کە یەکەم جار لە شوێنەکانی وەک کینیا لە ساڵانی دەیەی ۱۹۵۰ و ۱۹٦۰ ڕووبەڕووی بوونەوە، بەڵام ئێستا خراپتربووە.

تووشبووانی MDR_سیل بەلایەنی کەم بەرهەڵستی ئایزۆنیازید و ڕیفامپین دەکەن، کە دوو دژە زیندەیی باو و کاریگەرن. بە شێوەیەکی فراوان بەربەرەکانی دەرمان توشبووانی (XDR-TB) سیلی بەرهەڵستکاری فرە دەرمان کە بەرهەڵستکارە بۆ ئیسۆنیازید یان ڕیفامپین و لانی کەم یەکێک لە فلۆریۆکینۆلۆنسەکان و یەکێک لە دەرمانە تەزریقەکان_لە کاتێکدا کە لە ڕوودا نوێیە، بەڵام تەنها ڕووخسارێکی نوێی کێشە کۆنەکەیە. هەردوو سیلی -XDR MDR، و سیلی سادەی بەرهەڵستی دەرمان پێش ئەوانن، ئەنجامێکی هەڵە بەڕێوەبردنی دژەزیندەییەکان لە هەموو ئاستەکان: نەخۆشەکان دەرمانەکانیان وەرناگرن؛ لاوازی

جڵەوکردنــی نەخــوش؛ کورتهێنــانی دەرمــان؛ بەرنــامەی فەرامۆشکراوی پێدانی دەرمان.

ســـوربوون، لە هەنـــدێک کاتـــدا، لە ئەوەی کە ســـیلی بەرهەڵستکاری دەرمان بە سادەیی شتێکی گەورە نییە، و تـــازەترین گـــۆڕانی بیرکـــردنەوە، ئەو تێـــڕوانینەی کە چارەســـەری MDR_ســـیل لە ڕووی نـــرخەوە زۆری تێناچێـت. ســیلی بەرەهەڵســتکاری فــرە دەرمــانیش وەک HIV/TB، فەرامۆشکراوە. ئێستا سیل زیاتر لە هەر کاتێکی تر لە مێژوودا مرۆڤ دەکوژێت.




٧. سیل بە شێوەیەکی یەکسان کاری نەکردە سەر هەموو کەس، لە هەندێک شوێن بەربڵاوتربوو بەراورد بە شوێنەکانی دیکە.

# بەشی شەشەم
# ئەنفلۆنزا

ئەو ئەنفلـۆنزایەی کە لە دوو شـەپۆل لە سـاڵی ١٩١٨ و سـێیەم لە سـاڵی ١٩١٩ بە هەمـوو جیهانـدا بڵاوبـووەوە بەدرێژایی مێژوو و لە سەردەمی مەرگی ڕەشەوە خراپترین پانەپەتـابووە، ئەنفلۆنزا پێشـتر بە شـێوەی پانەپەتا جۆشـی سـەندبوو، بە ئەم دواییـانە، و بە تونـدی، لە سـاڵی ١٨٨٩ تـا ١٨٩٢. بەڵام هەرگیـز لە کـاریگەری پەتـاکەی سـەردەمی جەنگـی جیهـانی یەکەم نزیـک نەبـووەتەوە، کە بەلایەنـی کەمەوە پەنجا ملیۆن کەسی کوشت. زۆربەی ئەو مردنانە لە ماوەی مانگە ترسناکەکانی تشرینی یەکەم و نۆڤەمبەربوو.

ئەگەر ئـاوڕ لە دواوە بـدەین، ڕۆژنـامەی پزیشـکی بەریتانی British Medicah Journal لە مـانگی نیسـانی سـاڵی ١٩١٩ نووسـیویەتی کە ئەنفلۆنزاکەی بۆمبـای "بـووە

هــۆی وێرانکردنێــک کە تەنهــا مەرگــی ڕەش... دەتوانێــت هاوشــانی بێــت." هێشــتا نازانرێــت ڤایرۆســەکە لە کوێــوە ســەرچاوەی گرتــووە. هەر چەنــدە زۆر جــار ئاســیا بــاس دەکرێت.

لە ئیتالیا دەنگۆی ئەوە بڵاوبووەوە کە بە هیچ شێوەیەک ئەمە ئەنفلــۆنزا نیــیە، بەڵکــو شــەڕی کیمیــاییە کە لە لایەن ئەڵمانیەکانەوە ئەنجامدەدرێت.

نـامیلکەی پزیشـکێکی ئیتـاڵی لە ناونیشـانەکەیدا پرسیاری کردبــوو: "ئایــا دوایــین پەتــا بە جــددی ســەرچاوەکەی تاوانکارییە؟

یەکەم بڵاوبــوونەوەی ناســراو لە کــامپی فونســتۆن لە شاری کانساسبوی لە ٥ مارسی ١٩١٨، لە ئەوێوە گەشتیکرد بۆ قەڵاکانی تر و دەزگا سەربازییەکان. لە مـانگی نیسـاندا لە ڕێــگەی کەشــتیەوە بــۆ فەڕەنســا گــوێزرایەوە. پاشــان بە خێرایی لە ئەوروپا بڵاوبووەوە و گەیشتە باکووری ئەفریقا و هیندستان، لە مانگی یولیۆ بەرەو چین و ئوسترالیا چوو. ئەنفلـۆنزا دای لە زۆر پیـاوی کەنارەکـانی فلیپـین کە بـووە هـۆی چـۆڵکردنی شـوێنی بـارکردن و داگـرتن لە کەنـارەکە. پانەپەتـاکە لە مـاوەی چـوار مانگدا گەشـتی کـرد بە هەمـوو جیهاندا.

شــــەپۆلی دووەم، زۆر کوشــــندەتربوو، لە فەڕەنســــا لە مانگی ئابی ساڵی ١٩١٨ دەستیپێکرد، کە لە هەمـوو جیهانـدا بە خێرایــی دەگــوێزرایەوە لە ڕێــگەی بازرگــانی دەریــایی و گواســتنەوەی ســـەربازیی، کە لە هەمــان کاتــدا لە بۆســـتن؛ برێســـت، فەڕەنســـا؛ فریتـــاون، هەروەهـــا ســـیرالیۆن. هێڵــی شــەمەندەفەری تێــپەڕ بە ســیبریا ئەنفلــۆازای هەڵگــرت بــۆ

باکووری ئاسیا. سەربازانی هیندی و بەریتانی ئەنفلۆنزایان هێنا بۆ ئێران.

لە ئەوێ لە نێوان ١٠٪ بۆ ٢٥٪ ئەو دانیشتوانەی کوشت کە شەڕ و قاتوقڕی پێشتر وێرانی کردبوو. ئەنفلۆنزا گەیشتە ژاپۆن لەسەر کەشتیەک لە شاری بەندەری سیبری ڤلادیڤۆستۆک، پاشان بڵاوبووەوە بۆ ناوچەکانی داگیرکراوی ژاپۆنی. دوای ئەوەی گەشتە کەناری ڕۆژئاوای ئەفریقا، لە شاری فریتاون کە ڕۆژنامەکان بڵاویانکردەوە لە ئەو وڵاتە "هەموو شت سەروژێرە...خەڵک وەک مشک دەمرن.... مردووەکان ئێستا بە هۆی نەبوونی شوێن لە گۆڕستانەکان لە ناو چاڵەکاندا بەخاکدەسپێردرێن"

پەتاکە ڕێگای خۆی بۆ نێوەوەی وڵاتان کردەوە لە ڕێگەی هێڵی ئاسنینی تازە والاکراو. ئەو بە بێ ئاگاداری هات بۆ گانا. بەرپرسێکی داگیرکار، ئاماژەی بە ئەوە کردبوو کە لە باکوور "شاری لۆرا وەک گوندێکی چۆڵکراو وایە، کەس کەس نابینێت، من گوێم لێیە کە هەندێک لە پیاوانی ئاینی دەپرسن کە ئایا ئەمە کۆتایی جیهانە".

هەر کە گەیشتە کیپتاون، بە خێرایی لە ڕێگای هێڵی شەمەندەفەرەوە بەرەو باکوور ڕێگەی خۆی کردەوە. بڵاوبوونەوەی ئەنفلۆنزا لە باشووری ئەفریقا خێرابوو، چونکە ئەم نەتەوەیە یەکێک لە سەرقاڵترین بەندەری کیشوەرەکەی هەبوو و خاوەنی پێشکەوتووترین تۆڕی گواستنەوەی ناوخۆیی بوو. دواتر دوای ڕووباری کۆنگۆ کەوت بە کەشتی هەڵمی گەڕانەوە بۆ کەناری دەریای ئەتڵەسی.

ئەنفلۆنزا لە ڕێگەی بازرگانی ئۆقیانووسی هیندیەوە هاتە ئەودیوی ئەفریقا، یەکەم جار لە مۆمباسا لە کۆتایی مانگی ئەیلولدا دەرکەوت. لە ماوەی چەند مانگێکدا شەپۆلی دووەم بە نزیکەیی هەموو شوێنێکی نیشتەجێی ئەم هەسارەیەی ڕامالّیبوو. شەپۆلی سێهەمی نەرمتر لە زستانی سالّی ١٩١٩ گەیشت و لە بەهاردا ڕۆیشت.

هەموو شتێک تەواوبوو.

کاریگەریەکانی لەسەر دانیشتوان هێگجار زۆربوون. نیو ملیار کەس کە سێیەکی دانیشتوانی جیهانن تووشی ئەنفلۆنزابوون.

ڕاپۆرتی ناتەواو و دەستنیشانکردنی نا-ورد وادەکات گەشتن بە ژمارەیەکی وردی مردووان مەحالّبێت. لە زۆربەی شوێنەکان کە قورسترین لێدانیان هەبوو، وەک هیند و ولآتانی خوارووی بیابانی گەورەی ئەفریقا، زانیاری دانیشتووانناسی زۆر کەمبوو، و ژمارەی کارمەندانی پزیشکی سنووردرایش بووە هۆی هەلّگرتنی چەند تۆمارێکی کەم. چین، کە لەوانەیە پانەپەتاکە کاریگەری وێرانکەری لەسەری هەبووبێت، دەستی نەکرد بە هەلّگرتنی تۆمارەکان تا سالآنی دەیەی ١٩٣٠. بە پێی توندی نەخۆشیەکە بێت، بە دلّنیاییەوە ژمارەی مردووانی ڕاستەقینە لە ژمارە ئاماژە بۆ کراوەکان گەورەتربوو. ژمارەکان بە شێوەیەکی بەرچاو بە تێپەڕبوونی سالّ گۆڕان.

ئێدوین ئۆکس جۆردەن لە لێکۆلّینەوەکەی Epidemic Influenza: A Survey، کە لەلایەن کۆمەلّەی پزیشکی ئەمریکیەوە لە سالّی ١٩٢٧ بلآوکراوەتەوە، کۆی گشتی گیانلەدەستدانی جیهانی ئەنفلۆنزای بە ٢١.٥ ملیۆن کەس

مەزەندە کردووە. ئەمە بۆ دەیان ساڵ بە شێوەی پێوانەیی مایەوە، چونکە ژمارەیەکی کەم لە توێژەران ئارەزووی لێکۆڵینەوەیان لە پانەپەتاکان هەبوو. بەڵام ئێستا مێژوونووسان بە ژمارەکەی ئۆکێس دەڵێن "نزمی گاڵتەجارانە"، چونکە هەر کە مێژوونووسان بایەخێکی زیاتریان بە پانەپەتاکاندا، ئەوان ژمارەکەی ئۆکاسیان بەرزکردەوە، هەندێک جار بە شێوەیەکی بەرچاو، لە کاتێکدا هێشتا کەم لە بارەی شوێنەکانی وەک ڕووسیا و چین زانراوە، تازەترین مەزەندەی جیهانی پەنجا ملیۆنە؛ هەندێک پێیان وایە کە لەوانەیە ئەو ڕێژەیە بە ١٠٠٪ کەمبێت.

هەندێک وڵات، و تەنانەت هەندێک ناوچەی نێو وڵاتەکان زۆر قورستر لە هەندێکی تریان لێیاندرا؛ مردنیش جیاوازبوو لەسەر بنەمای تەمەن و ڕەگەز.

خەڵکی ڕەسەن لە ئوسترالیا، نیوزیلاند، و ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ئەندازەی چوار جار ڕێژەی مردنیان زیاتربوو لە دانیشتوانی دەوروبەریان. لە گوندی دوورە دەستی ڕەسەنی وێڵز لە ئەوپەڕی باکووری ئالاسکا، ئەنفلۆنزا پەتای دانیشتوانی پاکیزەبوو: ١٥٧ کەس لە کۆی دانیشتوانەکەی کە تەنها ٣١٠ کەسبوو گیانیان لەدەستدا.

هیندستان، کە نزیکەی هەژدە ملیۆنی تێدا مرد، تا ئەوپەڕ بەرزترین ئاماری مردووانی هەبوو. هەروەک لە شوێنەکانی تر، ژمارەی مردووانی هیندستان بەهۆی ئەنفلۆنزا_بە شێوەیەکی نادیار_لە نێو گەنجە پێگەشتووەکان چڕببووەوە. ئەمە زۆر جیاوازبوو لە پەتای ئەنفلۆنزای پێشوو و بڵاوبوونەوەی ئاسایی ساڵانە کە بەساڵاچووان و گەنجەکان بە شێوەیەکی نایەکسانانە پێی کاریگەردەبوون.

لە هیندستان ژنان قورسترین لێدانیان هەبوو، چونکە ئەوان چاودێری نەخۆشەکانیان دەکرد. یەکێک لە ئەنجامەکانی هەردوو مردنی تایبەت بە تەمەن و ڕێژەی زیاتری مردن لە نێوان ژنان دابەزاندنی ڕێژەی لەدایکبوونبوو لە هیندستان_لە ساڵانی دواتردا، بە ئەندازەی دابەزینی ٣٠٪ لە ساڵی ١٩١٩. چونکە ئافرەتان کەمتربوون، گەنجی زۆریش نەمابوو بۆ هاوسەرگیری.

پانەپەتاکە گەشتە هەندێک لە دوورترین کۆمەڵگاکانی جیهان. لە دوورگەکانی دەریای هێمن ئەنفلۆنزا وێرانکەربوو، ڕێژەی مردنیش لە ئەو دوورگانە زیاتربوو لە هەر شوێنێکی تر. هیچ دوورگەیەک نزیکەی کەمتر لە ٥٪ دانیشتوانەکەی لە دەستنەداوە. ساماۆئای ڕۆژئاوا قورسترین لێدانی هەبوو: ٢٢٪ دانیشتوانی کە نزیکەی ٣٨ هەزار دەبوون لە ماوەی چەند هەفتەیەکدا مردن. ئەگەر ئەمڕۆ لە ئەمریکا ئەوە ڕوویدات، حەفتا ملیۆن دەمردن. لە کاتێکدا کە بەڕێوەبەرایەتی دەریایی ئەمەریکی توانی ئەنفلۆنزا کەم تا زۆر لە بەشی ئەمریکی ساماۆئای ئەمریکی دووربخاتەوە، لە ڕێگەی دابڕاندنی توندی سەرنشینانی سەر کەشتییە هاتووەکان و ڕێگریکردن لە لەنگەرگرتنی بەلەمی پۆستە، هەرگیز ئەم جۆرە ڕێوشوێنانە لە ساماۆئای ڕۆژئاوا تاقینەکرانەوە. لە ئەنجامدا ئەنفلۆنزا گەیشت لە ڕێگەی کەشتی هەڵمی نیوزیلاندی تالۆن.

لە کاتی ڕۆیشتنی کەشتیەکە پسوولەی خاوێنی تەندروستی پێدرا، بەڵام لە هەفتەیەکدا لە نێوان دەرچوونی لە نیوزیلاند و لەنگەرگرتنی لە ساماۆئای ڕۆژئاوا ئەنفلۆنزا لە نیوزیلاند جددیبوو. هیچ کەس ساماۆئای ڕۆژئاوا یان

بەنـــدەرەکانی دیـــکەی پەیوەنـــدی ئاگـــادارنەکردبووەوە. دوورگەکـان دەربـارەی پانەپەتـاکە لە ڕۆژنامەکـانی سـەر کەشتی تالۆنەوە فێربوون، یان لە کاریگەریە وێرانکەرەکانی خـودی ئەنفلـۆنزاکە. هەر چەنـدە سـامۆئای ڕۆژئـاوا وەک نیوزیلانـد بەشـێکبوو لە ئیمپراتـۆریەتی بەریتـانی، هەروەهـا نەخۆشـییەکە بە باشـی لە هەمـوو جیهـانی زەریـای هـێمن ناسـراوبوو، بەڵام هـیچ کەس دوورگەکـانی لە سروشـتی نائاسـایی کوشـندەیی بڵاوبـوونەوەی ئەم جـارەی ئەنفلـۆنزا ئاگادارنەکردەوە، لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا، ئەنفلۆنزا بەسـەر دوورگەکەکاندا زاڵبوو. ٩٠٪ دانیشتوان نەخۆشکەوتن؛ ژیـانی کۆمەڵایەتی، و ئیداری، و ئابووری لە کارکەوت.

تونـدی پانەپەتـاکە لە چـاو شکسـتە ڕەوشـتییەکانی دوورگەنشـینانی زەریـای هێمـنەوە دەبینـرا. نـوێنەرێکی بەریتـــانی دەربـــارەی دورگەی تۆنگـــا نووســـیبووی: "دڵتەزێنتـرین تایبەتمەنـدی ئەو بڵاوبـوونەوەیە، بێبـاکی و کەمتەرخەمی سەرۆکی ڕەسەنەکان بوو لە هەمبەر ئازار و نـــارەحەتی گەلەکەیان....کاتێـــک کە بارودۆخەکـــان لە خراپترینیـان بـوون. تـاکە هـاوڵاتییەکی تونگـانی دەسـت نەدەکەوت تەنانەت بۆ کاری هەرە پێویست.

ئەم شکسـتە ڕەوشـتیانە دەرئەنجـامی سیاسـیان هەبـوو: "ئەو جـــۆرە ڕووداوانە دەبێـــتە هـــۆی ئەوەی کە تـــاک لە خەملاندنی بۆ کەسایەتیەکانی تۆنگان پێداچوونەوە بکات و بێ توانایی لە هەستکردنی قووڵ و گونجاوییان دەربـخەن لە بەرپرسـیاریەتی بـاڵای خۆبەڕێـوەبەری". ڕێـژەی لە ٩٥٪ مـردن کەمینەیەکـی هێشـتەوە کە توانـای پەرچەکـرداری بەهێزیـان هەبێـت. لەگەڵ ئەوەشـدا چـاودێرانی بەریتـانی

گلەییان لە دوورگەنشینان کرد بۆ وەڵامدانەوەی بێسوودیان بۆ پانەپەتاکە لە کاتێکدا بانگەشەیان بۆ هەوڵەکانی خۆیان وەک هەوڵی قارەمانانە دەکرد.

ڕێژەی مردن زۆر ترسناکبوو لە سامۆئای ڕۆژئاوا و زۆر پرسیاری هێشتەوە لە پاشڕەوی خۆی_بەشێوەیەکی سەرەکی، چۆن ئەمە ڕوویدا لە جیهانێک کە بەردەوام_باش لە پێکەوەبەستندابوو، جیهانێک کە هەواڵەکان بە خێرایی دەگوێزرانەوە؟ لە هاوینی ۱۹۱۹ نووسینگەی داگیرکاری بەریتانی لیژنەی پەتای سامۆئایان پێکهێنا بۆ لێکۆڵینەوە لەوەی بۆچی ڕێگە بە ئەنفلۆنزا درا بۆ تێپەڕبوونی بۆ سامۆئای ڕۆژئاوا و دوورگەکانی تر، لە کاتێکدا کە بە سەرکەوتوویی لە سامۆئای ئەمریکی دراوسێی دوورخرایەوە.

یەکێک لە پرسیارەکان ئەوە بوو کە "ئایا ناساندن و بڵاوبوونەوەی پەتای ناوبراو بەهۆی هەر کەمتەرخەمی و هەڵەیەک بووە لە لایەن هەر کەسێکەوە کە لە خزمەتی تاجی بەریتانی بێت، جا چ ئەوەی پەیوەندیدارە بە حکومەتی جێبەجێکاری نیوزیلاند یان پەیوەندیدار بە بەڕێوەبەرایەتی دوورگەکانی سامۆئای ڕۆژئاوا".

وەڵامەکە بەڵێ بوو. لیژنەکە دەستنیشانیکرد کە پینەوپەڕۆکردنی کارگێڕی بووەتە هۆی شکست لە گوێزرانەوەی هەر زانیاریەک لە سەر ئەنفلۆنزاکە. لیژنەکە زیاتری دۆزییەوە، کە کارگێڕی بەریتانیا لە سامۆئای ڕۆژئاوا پەتاکەی بە ئەندازەی پێویست بە جددی نەگرتبوو؛ پزیشکەکان وای بۆ چووبوون کە ڕابەریکردنیان بۆ پزیشکی هاوچەرخ دەبێتە هۆی ڕێگریکردن لە خراپترین

کاولکارییەکانی نەخۆشییەکە. شکستی ئاگادارکردنەوە سنووردار نەبوو، تەنها بۆ سامۆئای ڕۆژئاوا. فەرمانگەی داگیرکار کەسی ئاگادارنەکردبووەوە؛ داگیرگەکان خۆیان کارێکی باشتریان کرد بە ئەوەی بە دراوسێکانیان بڵێن ئەگەر ئەنفلۆنزایان هەبێت. هێشتا لە باشترین بارودۆخدا بڵاوبوونەوەی هەواڵەکان هەڕەمەکیبوو.

کاتێک ئەنفلۆنزا بوو بە نەخۆشییەکی ناسراو، هەواڵ دەگەیشتە داگیرگەیەکی دیاریکراو، تەنها کاتێک، بۆ نموونە، سیرالیۆن و گامبیا بڕیاریاندا بە ئاگادارکردنەوەی نایجیریای دراوسێیان یان کەسێک کە لە ڕۆژنامەکاندا لە سەری خوێندبێتەوە، یان لە هەمووی خراپتر کاتێک کە ئەنفلۆنزاکە خۆی دەرکەوتبێت.

وێرانکارییەکانی پانەپەتاکە ڕوونبوو. هۆکاری ئەوەی کە بۆچی لەبەر چاوی خەڵکی ئەو کاتە وانەبووە، لەبەر ئەوەی ئەنفلۆنزا پانەپەتایەکی نوێ نەبوو، هەروەها ڕووداوی ساڵی ١٩١٨ دواین بڵاوبوونەوە نەبوو. پانەپەتاکان لە سەدەی شازدەوە شەقڵێکی ئاسایی مێژووی مرۆڤبوون. هەروەها ئەنفلۆنزا بۆ ماوەیەکی زۆر پێشتر سەردانکەرێکی ساڵانەبووە. تەنها نەوەیەک پێشتر پانەپەتا هەبووە لە ساڵی ١٨٨٩-١٨٩٠، هەروەها دانەی تر هەبووە لە ساڵانی ١٩٥٧، ١٩٦٨ هەروەها ساڵی ٢٠٠٩. بەڵام پانەپەتای ساڵی ١٩١٨ جیاوازبوو.

ئەنفلۆنزا ڤایرۆسێکە سێ جۆری هەیە، ئەنفلۆنزای A کوشندەترین و بەربڵاوترینە، کە نەخۆشییەکی مرۆئاژەڵییە_لە ئاژەڵەوە بۆ مرۆڤ دەگوازرێتەوە، بەڵام تیرەی ڤایرۆسەکەی تا پێش ساڵی ١٩١٨ نەبینراوە و تاکو

ساڵی ٢٠٠٥ دەخایەنێت. تەنها بۆ ناساندنی ڤایرۆسەکە وەک تیرەی H1N1 (کە H بۆ hemagglutinin دەوەستێت، N بۆ neuraminidase؛ هەردووکیان پرۆتینن) کە چەندین تایبەتمەندی جیاوازیان هەیە.

ئەو ئەنفلۆنزایە بە ڕێژەی بیست جار زیاتر دەیدا لە پێگەشتووە گەنجەکان بەراورد بە پانەپەتای ئەنفلۆنزای پێشوو و بڵاوبوونەوەی پەتا وەرزی ئاسایی، کە بە گشتی کاریگەرییەکی زۆر گەورەتری هەبووە (دەبێت) لەسەر گەنجەکان و پیرەکان. توشبوون زۆربەی کات بە خێرایی بەرەو جۆرێکی کوشندەی نەخۆشیی هەوکردنی سی دەڕۆشت. مردنی زۆر بەرزتربوو لە هەر نەخۆشییەکی ئەنفلۆنزای تر.سێ شەپۆلی جیا، یەک لە سەر یەک کەڵەکەبوو، هیچ کاتێکی نەهێشتەوە بۆ چاکبوونەوە یان خۆ ئامادەکردن.

بۆچی هەموو ئەمانە هێشتا تا ڕادەیەکی زۆر نادیار ماونەتەوە، زۆر بە تایبەتی توندی نەخۆشییەکە. ئەوەی زانراوە لە نموونەی ئەرشیفی ڤایرۆسەکە_کە لە ساڵی ٢٠٠٥ ڕێگەیدا بە ڕیزکردنی تەواوەتی بۆ هێڵی بەلایەنی کەمەوە ڤایرۆسی پایزی ساڵی ١٩١٨_ئەوە دەرکەوت کە پێشینەی هەر چوار ڕەگەزی مرۆڤ و بەرازی ئەو تیرانەیە کە بە H1N1 و H2N2 ناودەبرێن. بەڵام کاتێک گەیشت لە ساڵی ١٩١٨ نوێ بوو. دەگونجێت لە مرۆڤەوە سەرچاوەی گرتبێت و دواتر بۆ بەراز پەڕی بێت.

هێشتا، ئەوەندە نەزانراوە کە دڵنیایانە وابڵێین، هەروەها ڕوون نیە کە کە ئایا دوولەت بووە بۆ هەردوو نەوەی مرۆیی و بەراز. لێکچوونی بۆماوەیی لە نێوان ئەنفلۆنزای

مرۆیـــی و بەرازیـــی هـــاوچەرخ و هەروەهـــا پەیوەنـــدی درێژخـــایەنی نێـــوان ئەنفلـــۆنزا لە بەراز و مـــرۆڤ وای لە توێژەرانی ئەنفلۆنزا کرد بۆ ئەوەی ئەو ئەنجامە هەڵهێنجێنن کە بەرازەکان دەکرێت ڕۆڵی نێوەندگیرییان هەبێت لە نێوان ئەنفلـۆنزای بەردەوام سـوڕاوە لە نێـو ئـاژەڵان و پانەپەتـای جاروبـاری مـرۆڤ.ئەم ڤایرۆسـە تـا سـاڵی ١٩٩٧ درێـژەی هەبـوو، لەو سـاڵەدا جۆرێکی تونـدی کوشـندەی ئەنفلـۆنزای باڵنـــدە لە هۆنـــگ کۆنـــگ ناســـراو بە H5N1 دەرکەوت و ڕاســـتەوخۆ پەڕی بـــۆ مـــرۆڤ. بەڵام لە ئەو کـــاتە بەدواوە ئەنفلـــۆنزای H5N1 تەنهـــا لە گـــێڵگەی پەلەوەریەکـــانەوە گواستراوەتەوە بۆ مرۆڤ. گواستنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆڤ هێشتا بە شێوەیەکی یەکلاکەرەوە ڕوونەداوە. ئەوە ڕوونتر و ڕوونتربـــووە کە گەورەتـــرین کۆگـــای ئەنفلـــۆنزای A لە ڕاستیدا باڵندەیە، بە تـایبەت باڵندەی ئـاوی. بە دیـاریکراوی ئەو دۆزینەوەیەی کە ئەنفلۆنزای باڵندە دەتوانێت ڕاستەوخۆ بپەڕێـت بـۆ مـرۆڤ. بیردۆزەکـانی پێشـووی گواسـتنەوەی ئەنفلۆنزای نوێکردەوە و ئەو ڤایرۆسناسانەشی_کە ڕۆژانێک ئەمەیـــــان بە ئەســـــتەم دانابوو_ئاگـــــادارکردەوە لەگەڵ بەرپرسانی تەندروستی گشتی.

هەروەها ئەوە بۆ توانای ئەنفلۆنزا بۆ بازدان لە ئـاژەڵەوە بـــۆ مـــرۆڤ و بە پێچەوانەشـــەوە زیـــادبکە کە بە زۆر و بەخێرایی شێوەی دەگۆڕێت (بۆیە هەموو پایزێک زیاتر یان کەمتر پێویستیمان بە پێکوتەیەکی ئەنفلۆنزای نوێ هەیە) لە ڕێـــگەی زنجیـــرە کـــردەیەک کە ناســـراوە بە ڕامـــاڵینی دژەپەیداکەر. هەروەها زنجیرە کردەی دووبارە ڕێکخستنەوە جۆرێکە لە ڕاماڵینی دژەپەیداکەر کە ڕوودەدات کاتێک چەند

تیرەیەکی جیاواز لە ڤایرۆسەکە تێکەڵدەبن بۆ بەرهەمهێنانی تیرەیەکی نوێ؛ وا دیارە، ئەمە ئەو شتەیە کە ڕوویداوە لە سالانی ١٩١٨ و ١٩٥٧ و ١٩٦٨. لە داهاتوودا ئەگەری ئەوە هەیە کە ئەنفلۆنزای H5N1 بە جۆرێک بگۆڕدرێت کە لە نێوان مرۆڤەکاندا گوێزراوەبێت، ئەمەش دەبێتە هۆی پانەپەتایەکی نوێ لە نێو ئەو دانیشتوانانەی کە مەترسی توشبوونیان لەسەرە.

بە هۆی ئەوەی ئەنفلۆنزا شێوە گۆڕە، کۆمەڵێک توێژەری دیاری ئەنفلۆنزا لە ساڵی ٢٠١٠ نووسیویانە: "سەرەڕای بەردەوامبوونی پێشکەوتن لە زۆر بواردا، لەوانە چڕکردنەوەی چاودێریی مرۆیی و ئاژەڵی و پشکنینی مەودا_فراوانی بۆ هێڵی ڤایرۆسی، ئێمە لەوانەیە ئەمڕۆ باشتر نەتوانین پێشبینی و ڕێگری بکەین لە سەرهەڵدانی پانەپەتای ئەنفلۆنزا بەراورد بە ٥ سەدە پێش ئێستا، هەروەک لە دەرکەوتنی تەواو چاوەڕواننەکراوی پانەپەتای ڤایرۆسی H1N1 ساڵی ٢٠٠٩ پیشاندرا"

لە کاتێکدا ئێمە بڕێکی زۆر دەربارەی نەخۆشییەکە دەزانین، زۆر شت هەیە کە هێشتا فێڵمان لێدەکەن، ئەو فێڵبازییە هاوەڵ لەگەڵ توانای ئەنفلۆنزا، بۆ ئێمە سەرزشۆڕکەر دەبێت. پانەپەتای ساڵی ١٩١٨ لە کاتێکدا گەشت کە پزیشکی هاوچەرخ متمانەیەکی نوێی هەبوو بە توانای دۆزینەوەی هۆکاری نەخۆشیەکان و پاشان پێشکەشکردنی چارەسەر. بەڵام پێش پەرەسەندنی پێکوتەکان لە سالانی دەیەی ١٩٤٠ و ئەولاتر، پزیشکی بە تەواوەتی بێ بەرگریبوون لە دژی ئەنفلۆنزا.

بەڵام زانستی پزیشکی ئەمەی نەدەزانی. سەرەتا لە ساڵانی دەیەی ١٨٩٠ بە هەڵە بیر لە ئەنفلۆنزا دەکرایەوە، کە ئەنفلۆنزا نەخۆشییەکی بەکتریایی بێت_بە ناوی فایفەری چیلکەیی بانگدەکرا دوای دۆزینەوەکەی لە لایەن زانای ئەڵمانی جۆهان فریدریش فایفەر پسپۆڕی نەخۆشیە گوێزراوەکان. لە کاتی پانەپەتا، کۆمەڵەیەک لە پێکوتەکان دەرکەوتن، هەروەها چەندین هەوڵی چارەسەری دیکە. بەڵام هیچیان کاریان نەکرد. باکتریاناسی هیچ سوودێکی نەبوو. هەروەها تا ساڵی ١٩٣٣ کە ڤایرۆسناسی تەواو پێگەشتووبوو، ئەنفلۆنزا وەک ڤایرۆس دەبینرا. لە ماوەی پانەپەتاکان هیچ شتێک نەبوو کە بیوەستێنێت یان چارەسەری بکات. لە داگیرگەکان پزیشکی هاوچەرخ هیچ کاریگەرتر نەبوو لە "پزیشکی ڕەسەنی" زۆر جار ڕەخنە لێگیراو، کە وا بڕیاربوو شوێنی پێ چۆڵبکرێت. بەرپرسانی داگیرکار و پزیشکە ئاوارەکان نیگەرانیان تۆمارکرد لە ناکارابوونی پزیشکی ڕۆژئاوا، کە پەیوەندی خەڵکی ناوچەکەی بە چاککەرەوە فۆلکلۆرییەکان بەهێزکرد. لە بۆمبای ئەمە بووە هۆی نوێکردنەوەی ئارەزوو بۆ پزیشکی ئەیورڤێدی و یونیانی.

لە سیرالیۆن، چارەسەرکردنی پانەپەتاکە لە لایەن دەسەڵاتدارانی داگیراکار وایکرد کە سەروتاری هەواڵنامەی هەفتانەی سیرالیۆن دەستپێبکات بە، "پێویستە پانەپەتاکە...بکرێتە خاڵێکی جیاکەرەوە لە مێژووی وڵاتەکەمان. ئەوە دە جار زیاتر ڕوونترکراوە.... کە خۆشگوزەرانی ئێمە دەکەوێتە سەر، لەسەر پێوە ڕاوەستانمان و ئەنجامدانی کارەکانمان بۆ خۆمان" لە

ڕاستیدا نەبوونی چارەسەرێکی کاریگەر، ڕێگری لە پزیشکەکانی نەگرت لە پێشکەشکردنی ڕیزێکی فراوان لە "چارەسەر".

فەرمانداری ڕەسەن لە بێلینگو، ڕۆدسیای باشوور "ئەنجامی سەرنجڕاکیشی" بەدەستهێنا، لە تێکەڵەی هەویری خەردەل، ڕۆنی گەرچەک، کۆنیاک و ئەوەی کە پێی دەوت "تێکەڵەی هەوکردنی سییەکان." ئەوانی دیکە پاڕافین و شەکریان بەکارهێنا. لە سەرەتادا سەرەڕای متمانە بە ئەم چارەسەرانە، بەڵام بەڕێوەبەرانی داگیرکار و پزیشکەکان، دانیان بە ئەوەدا ناوە کە لە کۆتاییدا ئەفریقییەکان ئەم "چارەسەرانە"یان بینیوە لەسەر شێوەی ڕاستەقینەیان: فیڵبازی.بەشی ڕەسەن نابەدڵانە دانی بە ئەوەدا نا کە ئەو پێشکەوتنەی پزیشکەکان و نۆرینگەکان بەدەستیانهێناوە لە قایلکردنی خەڵک بۆ وازهێنان لە پزیشکی خۆماڵی لەناوچوو هەر کە خەڵک "زۆر لە متمانەیان بۆ کارایی دەرمانی ئەوروپی لە دەستدا." ئەفریقییەکان وەرگرتنی چارەسەری ئەوروپیان دەبەستەوە لەگەڵ مردن و نەخۆشی. لە بەشەکانی ڕۆدێزیای باشوور، ئەفریقیەکان بڵاوبوونەوەکانی نەخۆشی ئەنفلۆنزایان بە نهێنی هێشتەوە، چونکە ترسی ئەوەیان هەبوو کە تووشبووان بنێردرێنە لازارتۆی ترسناک (نەخۆشخانەی دابڕاندن) یان ناچاربکرێن کە دەرمان وەربگرن کە زۆرێک لە نەخۆشییەکە بە خراپتر دایاندەنا. ئەمە بۆ ئەوە نییە کە بڵێیت وەڵامدانەوەی ئەفریقی کاریگەربوو، یان وازهێنان لە دەرمانی ئەوروپی بۆ ئایۆرڤیدی یارمەتیدا، بەڵکو چارەسەری خۆماڵی هیچی نەکرد. هیچ سیستەمێک کاریگەرنەبوو. کاتێک ئەنفلۆنزا بۆ

یەکەم جار، لە بلۆمفۆنتینی، باشووری ئەفریقا دەرکەوت، کاردانەوە سەرەتاییەکان بریتیبوو لە بێدەنگبوون. "شارەکە بە جۆرێک خۆی بە تەندرووست دەزانی کە پەرتووکی ڕێنوێنی ناوچەیی پێی دەوت "ئاسایشگای ئەفریقای باشوور."

شارەکە ئەوەندە دڵنیابوو لە توانای بۆ لادانی تەندروستی خراپ، کە لە سەرەتای مانگی تشرینی یەکەم، لە کاتێکدا ئەنفلۆنزا لە ڕۆژئاوای ئەفریقا خەڵکی دەکوشت، ڕۆژنامە ناوچەیەکان پرسیبوویان کە ئایا دەبێت چەند ترسناکبێت "هاوڕێکەمان ئەنفلۆنزا؛ ئەو نەخوشیە ئاسایی و باو و خۆماڵیە." ئەوان بە زوویی وەڵامیان دەستکەوت کاتێک تەرمەکان کەڵەکەدەبوون و نەخۆشخانەکان دەستەپاچەبوون. پیرێکی کەنیسەی پرۆتستانتی هۆڵەندی دواتر لە مانگی تشرینی یەکەمدا گوتی: "ئەوە بۆ من وا دیاربوو کە کۆتایی مرۆڤایەتیە." کۆستەکە شارەوانی هاندا بۆ ئەنجامدانی ڕێگری و وەستاندنی چالاکی_سینەماکان و قوتابخانەکان؛ دەرمانسازانی ناوخۆ ناچاربوون کە "تێکەڵەی ئەنفلۆنزا"، بێ بەرامبەر بۆ بەکارهێنانی گشتی دابینبکەن؛ ڕەش پێستەکانی ئەفریقیای باشوور ڕاپێچی سەربازی زۆرەملێ دەکران بۆ هەڵکەندنی گۆڕەکان.

ئینگلستان ئەو وڵاتەبوو کە خاوەنی یەکێک لە بەهێزترین ژێرخانەکانی تەندروستی گشتی بوو، یەکێک لە لاوازترین وەڵامەکانی بڵاوکردەوە. پرچەک بە باوەڕێکی نوێ لە بیردۆزی میکرۆب، پزیشکەکان باوەڕیان بە ئەوە هەبوو کە دەتوانن چارەسەری نەخۆشیەکە بکەن و ڕەتیان کردەوە کە قایلبن بە ئەوەی کە ئەوان هیچ ڕێکارێکی ڕاست و

دروســـتیان نەبوو.زیـــاتر لە ئەوە، زۆرێــک لە پســـپۆڕانی پزیشکی پێیـان وابـوو کە تـرس بەرەو پێشـچوونی ئەنفلۆنزا دروسـتدەکات، ئەمەش بـووە هـۆی ئەوەی خەڵـک لە بـارەی بڵاوبـــوونەوەی نەخۆشـــیەکە قســـە بکەن.بەرپرســـانی تەندروستی گشتی هانی ئارامییاندا. ئەمە، لەگەڵ متمانەی لە ڕادەبەدەریـان بە پزیشـکی هـاوچەرخ، وای لێیـان کـرد کە تونـــدی پانەپەتـــاکە بە کەم بگـــرن. بڵاوکراوەکـــانی وەک ڕۆژنـامەی پزیشـکی بەریتـانی ئامۆژگاریـان بە بێـدەنگی و دەستەوەستانی کرد:

سەرنووســـەرێک نووســـی، "کاتێـک بڵاوەپەتـا دروســت دەبێت، هەمیشە مردن ڕوودەدات. باشە ئەگەر تۆزێک دانایی زیاتر پیشان بدرێت لە بڵاوکردنەوەی ئەم جۆرە ڕاپۆرتانە، لە جیاتی کەڵەکەکردنیان تا چەند دەتوانن وەکو هەورێکی ڕەش بۆ تێکدانی نانی بەیانیانمان؟

لە ســەروتاری ڕۆژنـامەی Manchester Guardian ئەم هەســـتەی دووپـــاتکردبووەوە: "تـــۆقین هاوپەیمـــانێکی گەورەی ئەنفلـــۆنزایە، و ئەگەر بـــاری دەروونـــی گشـــتی لە ســـەرچاوەی تـرس دووربخـرێتەوە، ئەوا هەنگـاوێکی درێـژ نـراوە بـۆ بەزانـدنی بڵاوەپەتـاکە." کـاردانەوەی لە ڕادەبەدەر بەدیکـرا، بە تـایبەتی لە دەمـی شـــەڕ. هەر وەک ڕۆژنـــامەی Times لە مـانگی کـانوونی یەکەمـدا وتـی: "هەرگیـز لە کـاتی مەرگی ڕەشەوە هیچ پەتایەک بە ئەم شێوەیە تووشی دنیا نەبـــووە؛ هەرگیـــز، لەوانەیە، تـــاعوون زیـــاتر ئـــارمگرانە قبوڵکرابێـت." لەســـەر ئامۆژگـاری پزیشـکەکان، ئەنجـومەنی حکومەتی ناوخۆیی لەندەن کەمتر لە ئەو فەرمانەی کرد کە سینەماکان دەبێت باش هەواگۆڕکێ بکرێن. بە هۆی بەهێزی

باوەڕیان بە بیردۆزەی میکرۆب کە توانای ئارامکردنەوەی خەڵکی هەبوو بۆ بیرکردنەوە لە چارەسەر و ڕێگریەکان کە زۆر نزیکبوو دەرکەوتنیان، سەرچاوەی پێویست ئاڕاستە نەکرا بۆ کەمکردنەوەی هەندێک لە کاریگەریەکانی ئەنفلۆنزاکە. جەنگی جیهانی یەکەم کاریگەری قووڵی لەسەر ورە، لەسەر بەردەستبوونی پزیشکان (زۆر کەس دووربوون)، لەسەر بەردەستبوونی سەرچاوەکان بە گشتی هەبوو. ئەمە سەلماندی کە سەختە بۆ ئەوەی بەریتانیا بجوڵێنیت بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمنان لە دەرەوەی وڵات و پانەپەتا لە نێو وڵات. ئارپەر نیوزەوڵم، گەورە بەرپرسی پزیشکی لە ئەنجومەنی حکومەتی ناوخۆ نووسیویەتی:

بارودۆخی نەتەوەیی هەیە کە ئەرکی سەرەکی تێیدا ئەوەیە کە بتوانیت "بمێنینەوە" تەنانەت کاتێک مەترسی لەسەر ژیان و تەندروستی تێوەگلاوە. ئەم ئەرکە ئێستا دەربارەی ئەنفلۆنزا دروستبووە... ئەو پەتایە لە نێو کرێکارانی کەرەستەی جەنگی و کرێکارانی تر دروستبووە کە کارەکانیان گرنگی نەتەوەیی هەیە.... لە هەر یەکێک لە ئەو حاڵەتانەی ئاماژەی بۆ کرا دەکرێت هەندێک لە ژیانەکان بێنە ڕزگارکردن و بڵاوبوونەوە توشبوون کەمبکرێتەوە، و هەندێک لە ئازارەکان دووربخرێنەوە، ئەگەر نەخۆشە ناسراوەکان بتوانرایە لە تەندروستەکان جیابکرێنەوە؛ ئەگەر دوورخستنەوەی نەخۆشە ناسراوەکان و دابینکردنی زۆەملێی بۆشایی بۆ هەر کەس لە کارگە و شوێنی کار و سەربازگە و کەشتی جێبەجێ بکرێت؛ ئەگەر قەرەباڵغی زۆر بە بێ لەبەرچاوگرتنی هیچ شتێک قەدەغە کرابا. بەڵام تەنها "مانەوە" پێویستە.



**٨ لە ترسی ئەنفلۆنزا، سەربازەکان دەمامکیان بەستووە بۆ سەیرکردنی فیلم لە فەرەنسا لە ماوەی جەنگی جیهانی یەکەم.**

لە ماوەی چەند هەفتەیەکی کەم لە پاییزی ساڵی ١٩١٨ ئەنفلۆنزا ٢٥٠ هەزار کەسی لە ئینگلستان کوشت. پزیشکەکان و ئەوانی تر کە بەهۆی جەنگەوە پەریشان ببوون پەتاکەیان بە ئەو شێوە جددییە نەگرت وەک ئەوەی کە لەوانەیە هەبوو بێت، بەڵام زۆر کەس گەورەیی ئەو قەیرانەیان ناسیوە. وەک ڕۆژنامەی Times نووسیویەتی: "کارەساتەکە ئەوەندە گەورەبوو و بوونی لە هەموو شوێنێک بە جۆرێکبوو کە مێشکی ئێمە، کە پڕببوو لە ترسناکیەکانی جەنگ، ڕەتیکردەوە کە پەی پێ بەرێت. ئەنفلۆنزا هات و چوو، گەردەلولێک لەسەر زەوییە

سەوزەکانی ژیان، کە بە سەدان هەزار گەنجمان ڕادەماڵێت و نەخۆشی و نادروستیەکی وای لە پاش خۆی بەجێهێشتووە، کە کاریگەریەکانی لە ئەم نەوەیەدا هەژمار ناکرێت.

لە ویلایەتە یەکگرتووەکان، لە سەرەتادا، خزمەتگوزاری تەندروستی گشتی نامیلکەگەلێکی بڵاوکردەوە، پێشنیاری ئەوەی دەکرد کە بڵاوبوونەوەی ئەنفلۆنزا لە سەرانسەری وڵات لە زۆر شێوە خراپتر نیە لە پەتای ئاسایی ساڵانە. لە بەرامبەر بەرزبوونەوەی حاڵەتەکان، فەرمانداری تەندروستی شاری نیویۆرک بە درێژایی هەفتەی یەکەمی مانگی تشرینی یەکەمی ١٩١٨ بەردەوامبوو بۆ دابەزاندنی جددیتی نەخۆشیەکە. باوەڕبوون بە ئەوەی کە شارەکە دەتوانێت چارەسەری بکات، ئاگاداری هاوڵاتیانی کرد کە ئارام بمێننەوە، ترس تەنها شتەکان خراپتر دەکات.

لە ئیتالیا دەسەڵاتدارانی مەدەنی کاریگەرترین ڕۆژنامەی ئەو وڵاتەیان ناچارکرد، Corriere della Sera، کە لە کاتی بەرزبوونەوەی ترس و دڵەڕاوکێدا واز لە بڵاوکردنەوەی ئاماری مردووان بهێنن. ئەو وەڵامە ساکارانەی سەرەتا لە زۆر شوێن خۆیان لادایە لاوە بۆ ئەنجامدانی کردارگەلێک کە شارەوانییەکان بە جددیتی پانەپەتاکەیان دەزانی، بەڵام هێشتا پزیشکی بێ کاریگەری بوو. سەرەڕای شکستەکانی، دڵخوازی بۆ پزیشکی هاوچەرخ بە دەگمەن کەمبووەوە. شۆڕشی تاقیگەیی مژدانەی سەردەمێکی نوێیدا؛ هیچ ڕێگەیەک بۆ گەڕانەوەنەبوو.

لەگەڵ ئەوەشـــدا زۆرێـک لە پزیشـــکەکان و شـــارەزایانی تەندروســـتی گشـــتی ئامـــادەبوون دان بە ســـنووورداربوونی تواناکانیان بنێن.

لە ساڵی ۱۹۱۹ و بیرهێنانەوەی پانەپەتاکە، میلتون جەی ڕۆزنـاو، بەکتریانـاس لە گۆڤـاری Journal of the American Medical Association نووســیویەتی "ئەگەر ئێمە هیچ فێربووبێتین، ئەوە ئەوەیە کە تەواو دڵنیانین لەوەی کە ئێمە دەربارەی نەخۆشییەکە چی دەزانین."

ئەم جۆرە دانپێدانانە شـتێکی نائاسـایی نەبوو، لانـی کەم لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و نەبووە هۆی نائومێدی؛ بەڵکو زانـــا پزیشـــکییەکانی بەرەو دەرفەتەکـــان ئاڕاســـتەکرد. کاریگەریەکـانی پانەپەتـاکە قورسـە بۆ پێوانەکردن. زۆربەی کـارە مێژووییەکـان سـەرنجیان خسـتووەتە سـەر خـودی پانەپەتاکە، نەک ئەوەی بە دوایدا هات. توێژەرانی پزیشکی و پزیشـکی زینـدەیی، نەک مێژوونووسـان، زیـاتر گرنگیـان بە بـابەتەکە داوە. دەرکەوتنـی H5N1 و ئەنفلـۆنزای بەراز لە سـاڵی ۲۰۰۹_کە بە ئەو جـۆرە نەبـوو کە بە دێـوزمەیەکی جیهانی پێشـبینی دەکرا_بڕێکی نائاسـایی لە توێژینەوەکـانی وروژانـــد بـــۆ لێکـــۆڵینەوە لە بـــنەچە و دەرئەنجامەکـــانی پانەپەتـــای ســـاڵی ۱۹۱۸. پانەپەتـــا بەگشـــتی کـــاریگەریەکی قووڵی لەسەر ڤایرۆسناسی سـەدەی بیسـت و بیسـت و یەک هەبووە. بەڵام زۆر پرسیاری مێژوویی ماونەتەوە. هەنـدێک شـــت ڕوون دەردەکەون. بـــۆ نمـــوونە، لە ئەنجـــامی ئەو کارەســـاتەی ناوچەکـــانی زەریـــای هـــێمن، هەروەهـــا داواکارییەکـانی نیوزیلانـد و ئەفریقـای باشـوور بـۆ ئەوەی ئاگاداری لەسەر بڵاوبوونەوەی ئەنفلۆنزا بدرێت. سیسـتمێکی

چـــاودێری و ڕاپـــۆرتکردنی نەخۆشـــی بە فراوانـــی ئیمپراتـۆریەتی بەریتـانی هـاتە ئاراوە_سیستەمەکە تـا دوای جەنگـی دووەمـی جیهـانی بە گیـانەلایی مـایەوە، بەڵام پانەپەتـاکە ئـارەزووی بـۆ سیسـتەمێکی باشـتری چـاودێری ئەنفلۆنزای نێودەوڵەتی دروستکرد، سیستەمێک کە ئێستا بە شێوەیەکی بەرچاو بەهێزترە.

بەڵام چی دەربارەی کاریگەریە کەلتووری و ئابووری و سیاسـی و کـۆمەلایەتی و کـاریگەری لەسـەر ئامـاری دانیشتوان؟ لە ئەو شتە کەمەی کە ئێمە دەیزانین، وا دیارە پەتاکە لە ئەمریکا کاریگەری کەمی هەبووە. پانەپەتـاکە هەر چـی بووبێـت هەمـووی لە بیرکـراوە. کاریگەرییەکـانی بە زەحمەت لە یادەوەری یان وێژەدا دەدۆزرێتەوە. جگە لە ئەو چەنـد پەرتـووکەی کە بە تەنهـا بـۆ ئەو تەرخـانکرابوو، پانەپەتاکە بە دەگمەن لە هیچ شێوازێکی بەرچاو لە مێژووی ئەو سەردەمەدا دەردەکەوێت. بەڵام ئایا دەکرێت هەمان شت لە هیندسـتان ڕاسـتبێت، کە نـزیکەی بیسـت ملیـۆن کەس گیانیان لەدەست داوە؟ لەوانەیە، بەڵام ئێمە نازانین.

لە زۆربەی شـوێنەکانی ئەفریقا_ڕۆدێزیـای باشـوور، نایجیریا، زائیر و ئەفریقای باشوور، بۆ نموونە_زنجیرەیەک لە کەنیسە بۆ جەژن، یان پەرستگای ڕۆحی، دروستبوون. کەنیسەکانی ئەلادورا لە نایجیریا و کەنیسەی کیمبانگۆست لە زائیر، بـۆ نمـوونە کاتێک دروسـتبوون کە بە بۆچـوونی ئەوان پێغەمـبەران، لە لایەن خـوداوە ئاراسـتە دەکـرێن، بـۆ ئەوەی خەڵکەکەیـان لە کاولکارییەکـانی نەخۆشـی ئەنفلـۆنزا ڕزگـاربکەن. کڵێسـاکان بـۆ جەژن کە لە ڕۆدیزیـای باشـوور

دەرکەوتن لە دوای هاتنی ئەنفلۆنزاکە زۆر دوای نەمانی پەتاکە هەر مانەوە.

لە شاری بلۆمفۆنتینی ئەفریقای باشوور، پەتاکە کۆمەڵێک گۆڕانکاری دەستبەجێی لە یاساکانی تەندروستی گشتیدا هێنایە کایەوە و جووڵەیەکی دروستکرد بەرەو کەمکردنەوەی هەژاری، کاتێک شارەکە ناچاربوو ڕووبەڕووی ئەو ڕاستییە ببێتەوە کە بەو شێوەیەی بیری لێدەکردەوە نە تەندروست و نە بێ هەژار نییە "دانیشتوانەکە...کۆستیان کەوت لە ئاشکرابوونی هەژاران و ئەو شەرمەزارییەی کە ئەنفلۆنزا دەریخست" ئەمە، کارمەند و ئەمینداری گەنجینەی شارەکەی ڕاگەیاند.

یەکێک لەڕۆژنامەکانی شارەکە بە ناوی Friend نووسیبووی "ئەنجامە دەستبەجێیەکان بوو بە هاندانی ویژدانی گشتی بە ئاراستەی چاکسازیە کۆمەڵایەتیە دواخراوەکان. پلانەکان ئێستا لە ژێر چاودێریدان کە دوێنێ وەک خەونی پێشبینیکەرە ناماقوڵەکان دەبینران و ئەمڕۆ وەک پێویستییەکی بەپەلە داوا دەکرێت" چاکسازییەکان پێشتر وروژێنرابوون، بەڵام ئەوە پانەپەتایەکی پێویستبوو بۆ جولاندنی شارەکە بۆ کردار. وەک سەرۆکی شارەوانی بە لیژنەی پەتای ئەنفلۆنزای وت "شاری بلۆمفۆنتین زۆر دەمێکە پلان و نیەتێکی لەو جۆرەی هەبووە، بەڵام ئەزموون لە بڵاوەپەتاکە پەلەی لە بابەتە کرد و بۆچوونی گشتی هاندا، کە ئێستا بۆ ئەو جۆرە چاکسازیانە ئامادەیە" بۆ ئێستا، کەسێک تەنها دەتوانێت بپرسێت کە ئایا پەتاکە بووە هۆی چاکسازی هاوشێوە لە شوێنەکانی تر، جا وازبهێنە لە ئەگەری کاریگەرییەکانی لەسەر لایەنەکانی تری ژیان.

نەخۆشی ئەنفلۆنزای ساڵی ١٩١٨ ڕووداوێکی نوێبوو. بە پێچەوانەی مالاریا و سیل_پەتای هەمیشەیین_ئەنفلۆنزا دێت و دەڕوات. لە ئەم ڕووەوە زیاتر بە ئاوڵە یان تاعوون دەچێت. بێگومان ئەو دوو نەخۆشیە چیتر هەڕەشەیەکی گەورەی جیهانی نین. بەڵام ئەنفلۆنزا هێشتا هەر هەڕەشەیە. کاتێک H5N1 لە ساڵی ١٩٩٧ لە مرۆڤدا دەرکەوت و تیرەی نوێی H1N1 لە ساڵی ٢٠٠٩ ساڵی ١٩١٨ی هێنایە بیری جیهان. بەڵام هێشتا ڕووی نەداوە. ئێمە نازانین کەی ڕوودەدات.

ئێمە وەک ئینگلزەکان واین لە سەدەی حەڤدەدا، ئەوان دەیانزانی کە پەتا لە ئەوێیە، لە کەمیندابوون، ئامادەبوون بۆ هێرشکردنە سەری. ئەوان کەم تا زۆر خۆیان شلکردبوو بۆ گەڕانەوەکەی. ئەوان نەیاندەزانی کەی یان بۆچی دەگەڕێتەوە. ئەوان، بە زۆری، چۆنیەتی هاتنەکەیان دەزانی: بە کەشتی لە دەرەوەی وڵاتەوە. کاتێک زانیان خەریکە دێت، لە هەوڵی خۆپاریزیدا بوون، پاراستنەکەیان تەنها بریتیبوو لە دوورخستنی تاعوون بەهەر شێوەیەک بێت، ئەویش بە وەستاندنی کەشتییەکان، کە تاکە شتبوو دەکرا توانایەکی هەبێت بۆ لابردنی پەتاکە.

ئێمە ئێستا پێکوتەمان هەیە، سیستەمێکی چاودێری جیهانی بەهێز و لە هەندێک شوێن ژێرخانی تەندروستی گشتی بە باشی بەڕێوەدەبردرێت. لەگەڵ ئەوانەش، ئێمە هێشتا وەک هاوتاکانی سەدەی حەڤدەمان بە نیگەرانییەوە سەیری کەنارەکە دەکەین. سەرەڕای ئەوەش، لە کاتی پەتایەکی کوشندەدا زۆرێک لە هەمان ئەو شتانەی کە نەخۆشی سیل و مالاریای بە زیندوویی و باشی

هێشتەوە_ناوچە هەژارەکانی جیهان_لەگەڵ شتەکانی تردا نەبوونی ژێرخانی تەندروستی گشتی، دەستگەیشتنی نا پێویست بە دەرمانی خۆپاریزی، سیستەمی بەرگری تێکچوو، و بەربلاوی هاوەڵە نەخۆشیەکان_دڵنیایی ئەوە دەدات هەر وەک چۆن لە ساڵی ١٩١٨، هەر پانەپەتایەکی تری ئەنفلۆنزای داهاتوو کاریگەرییەکی زۆر بەربلاوی دەبێت.

لە کاتێکدا ئێمە ئێستا بە تەواوی ئاگادارین لە ئاڵانگارییەکانی بەرەنگاربوونەوەی ئەنفلۆنزا، جیاواز لە ساڵی ١٩١٨ زۆربەی ڤایرۆسناسەکان و بەرپرسانی تەندروستی گشتی خاوەنی بڕێکی ناتەندروستی متمانەنین، بەڵام ئێستا لەوانەیە زۆر قورس بێت بۆ کۆکردنەوەی نیگەرانی، چونکە بۆ زۆرێک، ئەنفلۆنزا بە سادەیی هاومانای هەڵامەتە.

هەردوو ئەنفلۆنزای بەراز لە ساڵی ١٩٧٦ و پانەپەتای H1N1 لە ساڵی ٢٠٠٩ زۆر کەمتربوون لە ئەو ئاستەی کە زۆرێک لە بەرپرسانی تەندروستی گشتی پێشبینیان دەکرد. هەموو ئەم شتانە دەتوانن کۆببنەوە بۆ گەشتن بەو تێڕوانینە کەموکورتەی کە بە گشتی کاتێک ڤایرۆس دێت و نیگەرانی گشتی دروستدەکات، سەبارەت بە ئەگەری ڕوودانی پانەپەتایەکی کوشندە. ئەوە هەڵەیە.

# بەشی حەوتەم

# ئایدز

گەیشـــتنی نەخۆشـــی ئایـــدز کۆتـــایی ســـەردەمی لەخۆبـــاییبوونبوو. هەمـــوو فشـــە فشـــێک ســـەبارەت بە لەنـــاوچوونی نەخۆشـــییە گوێزراوەکـــان لەســـەر دەســـتی پزیشکی زیندەیی یان ئومێدی ژیان لە جیهانێکی خاڵی لە درم دیـــار نەمـــا، ئەمەش بە تـــایبەت کە دەرکەوت ئایـــدز نەخۆشییەکی تازەی گوێزراوەیە و گەشەدەکات لە جیهانێک کە وا بیردەکـــاتەوە کە لە لێـــواری ڕزگاربوونـــدایە لە ئەو جـــۆرە هەڕەشـــانە.ئایدز لە ســـەرەتای ســـەدەی بیســـتەوە لە ناوەڕاســـتی ئەفریقیـــادا دەرکەوت، بەڵام لە بەهـــاری ســـاڵی ١٩٨١ بە شـــێوەی ناســـراوی ئێســـتای دەرکەوت، کاتێـــک پزیشـــکەکان لە لـــۆس ئەنجلـــۆس و شـــاری نیویـــۆرک دەســـتیانکرد بە تێبینـــدانی بەزربـــوونەوەیەکی نـــامۆ لە نەخۆشـــــیە دەگمەنەکـــــان، وەک هەوکردنـــــی ســـــیی (pneumocystis carinii) کە تووشـبوونێکی کەڕوویـیە،

ئەو کەسانەی کە بەرگری لەشیان تێکچووە مەترسی توشبوونیان هەیە و هەڵئاوسانی ناوەندە شانەی کاپۆسی (kaposi  sarcoma) کە جۆرێکی دەگمەنی شێرپەنجەیە، بە زۆری لە بەتەمەنەکاندا دەدۆزرێتەوە. لە ئەوەش نامۆتر ئەوە بوو کە ئەوانە لە ئەو پیاوە هاوڕەگەزبازانەی کە لە ڕووی سێکسیەوە چالاکن کۆدەبوونەوە. پاشان، لە ماوەی ساڵی داهاتوودا، گرۆکانی دیکە، کە بریتیبوون لە هەڵگرانی نەخۆشی هیمۆفیلیا و بەکارهێنەرانی دەرزی ماددە هۆشبەرەکان، بە هەمان شێوە توشی نەخۆشییەکان بوون.

خەڵکانی هایتی، ئەوانیش وا دەردەکەوت کە تێ کەوتبێتن. دکتۆرێکی بەلجیکی، پیتەر پیۆت، کە بەردەوام ئاگاداربوو بۆ هەواڵەکانی ناوەندەکانی جڵەوکردنی نەخۆشییەکان، هاوشێوەبوونی ناسیەوە لە نێوان ئەو شتانەی کە دەربارەی ئەمریکا دەیخوێندەوە و ئەوەی دەیبینی لە نۆرینگەکەی خۆی لە شاری ئەنتوەرپ، نۆرینگەیەک کە کۆچبەرانی ئەفریقی بەردەوام سەریان لێدەدا. ڕاپۆرتی زیاتر و زیاتر لە ناوچەکانی تری جیهان دەستیانکرد بە دەرکەوتن دەربارەی حاڵەتی ئاشکرانەکراوی ئاوسانی ناوەندە شانەی کاپوسی و پۆلێک لە تێکچوونەکانی تری بەرگری لەش.

چی ئەم دەستە و گرۆیانەی بە یەک بەستەوە؟ بۆچی هەموویان بە بوونیان بە خانەخوێی ئەو نەخۆشییانە دەناڵێنن کە دەگمەنن و بە گشتی دەتوانرێت لە ڕێگەی سیستەمێکی بەرگری تەندروستەوە شەڕیان بکرێت؟ کۆمەڵگەی پزیشکی زیندەیی سەرنجی ڕاکێشرا. لە سەرەتادا و بەداخەوە، ناوەندی جڵەوکردنی نەخۆشییەکان ناوی لێنا

نەخۆشیی نەمانی بەرگری لەشی هاوڕەگەزبازان: لە هاوینی ساڵی ١٩٨٢ ناوی فەرمی و هەمیشەیی خۆی پێ بەخشرا: ئایدز (نەخۆشی نەمانی بەرگری لەشی بەدەستهاتوو). ماوەیەکی زۆر نا، لە ساڵی ١٩٨٣ و ١٩٨٤ بە دوای یەک، پەیمانگای پاستر لە فەرەنسا و پەیمانگای شێرپەنجەی نەتەوەیی لە ویلایەتە یەکگرتووەکان ڤایرۆسەکەیان دیاریکرد. هەر کەس بە شتێکی جیاواز ناوی دەبرد. هەر لایەکیان بە تەنها بانگەشەی شانازی دۆزینەوەی دەکرد. بەڵام هەر زوو کۆمەڵگەی پزیشکی لەسەر ناوێک جێگیربوو: ڤایرۆسی نەمانی بەرگری لەشی مرۆڤ(HIV).

ئایدز ئێستا نزیکەی سی ملیۆن کەسی کوشتووە و نزیکەی ٧٥ ملیۆن کەس لە جیهاندا تووشبووە. ساڵانە دەیان هەزار حاڵەتی نوێ دەردەکەون. هیچ بەشێکی ئاوەدان لە گۆی زەوی نییە نەخۆشی ئایدز نەیگرتبێتەوە. بەڵام کاریگەری یەکسانی لەسەر هەموو شوێنێک نەبووە: زیاتر لە سێیەکی هەموو حاڵەتەکانی توشبوون و مردنەکان لە باشووری ئەفریقیا ڕوویاندابوو. لە هەندێک شوێندا، وەک ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، ئەمریکای لاتین، ژاپۆن و بەشەکانی ئەورووپا، ئایدز بە زۆری کاریگەری لەسەر بەشێکی پەراوێزخراوی کۆمەڵایەتیی دانیشتوان هەبوو؛ لە ساڵی ٢٠٠٤، ئاماری نوڕینگەکانی پێش زایین لە سوازیلاند ڕێژەی ٤٢.٦٪ توشبوونی ئاشکراکرد.

کاتێک کە ڕەچاوی ئایدز دەکرێت هاوشانی ئەو هۆکارانەی دیکە کە بەرپرسن لە نەخۆشییەکانی تر، دۆزینەوەی ڤایرۆسی HIV تەنها دوو ساڵ دوای ئەوەی کە سەرەتا ئایدز کەوتە بەر چاودێری پزیشکی زۆر سەرنج

ڕاكێشـە، هەزارەهـا سـاڵی خایانـد بـۆ ئەوەی تێبگەین کە چ شتێک بووەتە هۆی تاعوون، دەیان ساڵ لە پێشڕەویەکان لە زینـدەزانی گەردی و بەرگریناسـی و ڤایرۆسناسـی بـۆ ئەوە گەواهی دەرن.

دەسنیشـانکردنی خێـرای ڤایرۆسـەکە و خەرجکردنـی بێسـنووری حکـومەتی فیـدراڵی ئەمریکـا بـۆ تـوێژینەوەی پزیشکی (ویلایەتە یەککگرتووەکان زۆر زیاتر لە هەر وڵاتێکی تر لە توێژینەوەی ئایدز داهـاتی خەرجکردووە) بووە هۆی پێشـبینی دەسـتبەجێی پێکـوتە و بـۆ مـاوەیەک پاڵپشـتی پزیشـکی هـاوچەرخ بـوو لە متمـانەبوون بە توانـاکەی. بەڵام گەشـبینیەکە بەردەوام نەبـوو. ناسـینەوەی ڤایرۆسـەکە بەس نەبـوو. HIV دەرکەوت کە ڤایرۆسـێکی ئـاڵۆزی جـۆری ڕیترۆڤایرۆسە لەگەڵ چەندین ناسنامەی جیاواز. لە ڕاستیدا دوو ڤـایرۆس هەبـوو: HIV-1 و HIV-2، HIV-1 بەربڵاوتربوو. HIV-2 بە شێوەیەکی زۆر سنووردار‌بوو بۆ ڕۆژئـاوای ئەفریقا و زۆر خـاوتر دەجوڵا و قورسـتربوو بۆ گواسـتنەوە. HIV-1 پەرتبـوو بـۆ گرۆکـانی (M، N، O) و پاشان زیاتر بۆ یازدە جۆری دووەمی جیاوازی بۆماوەیی گـرۆی A تـا K. گـرۆی M بە شـێوەیەکی سـەرەکی بەرپرسـبوو لە پانەپەتـاکە، چـونکە بـووە هـۆی ٩٩٪ حاڵەتەکان. جۆرە دووەمیەکانی A، C ،D زۆرینەی زۆری حاڵەتەکانیان پێکدەهێنا، نزیکەی ٨٤٪. جۆری C بەرپرسبوو لە زۆربەی حاڵەتەکـان لە باشـووری ئەفریقـا و هیندسـتان و چین_بە ئەم شێوەیە بۆ زۆرینەی ڕێژەی HIV لە جیهان.

HIV 1 و HIV-2 هەردووکیـان نەخۆشـی مرۆئـاژەڵین (ئەو نەخۆشـیانەی کە لە ئـاژەڵەوە سـەرچاوەیان گرتـووە و

ئێستا مرۆڤ تووش دەکەن) و هەریەک لە جۆرە جیاوازەکانی HIV، کە نموونەی گواستنەوەی جیایە لە مەیمونی شامپانزیەوە (HIV-1) یان مەیمونی مانگابی سۆتی (HIV-2). گەورەترین هەمەجۆری بۆماوەیی HIV لە ناوەڕاستی ئەفریقایە. هەموو گرۆ دووەمییەکانی جۆری M لەوێ دۆزراونەتەوە، هەروەک چەندین شێوەی دووبارە تێکەڵبوو کە لە ڕووکاری بۆماوەیی ڤایرۆسەکە جیاوازن.

ئەم جۆرە هەمەجۆریە بۆماوەییە واتای ئەوەیە کە ئەمە ئەو ناوچەیەیە ئایدز بۆ درێژترین ماوە پەرەی تێداسەندووە، بەو شێوەیە خاڵی بنەچەیە بۆ پانەپەتاکە. ڤایرۆسەکە لە شامپانزیەوە بۆ مرۆڤ تێپەڕبووە، لە کاتێکدا لە دەوروبەری نۆرەی سەدەی بیست، کە زیاتر ئەگەری ئەوە هەیە خوێنی شامپانزی تووشبوو لە ڕێگەی بڕاوییەک یان برینێکی کراوەوە چووبێتە نێو لەشی ڕاوچییەک. لە نزیکەی ساڵی ١٩٢٠، HIV خۆی گەیاندە ناوچەی دەوروبەری لیۆپۆلدڤیل (لە ساڵی ١٩٦٦ کینشاسا). لەوێشەوە ڕێگای خۆی لە ئەفریقا کردەوە بە درێژایی تۆڕە پێشکەوتووەکانی گواستنەوە. خێراییەکەی گوڕی سەند لە هەندێک شوێن و کاتی جۆراوجۆر: هەڵمەتە پزیشکیەکانی سەردەمی داگیرکاری دژی نەخۆشی خەوتن، یاو و سیفلیس و زۆر بەکارهێنانی دەرزییەکان، بە ئەم شێوەیە ڕێگەی بە ڤایرۆسەکە داوە بە خێرایی بگوازرێتەوە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە خەڵک. تێپەڕاندنی HIV بۆ سوزانیەکان بە چارەسەرکردنیان بۆ سیفلیس لە ڕێگەی دەرزی نا پاکژەوە، بە تایبەتی ڕێگەیەکی کاریگەربوو بۆ هێنانی ئایدز بۆ نێو

دانیشتوانی گشتی له سالآنی دەیەی ١٩٥٠ و ١٩٦٠دا، کاتێک سوزانی پێویست توشبوو، HIV بلآوبووەوە.

بە تـایبەتی لە ژیـنگەی خێـرا گـۆڕاوی لیۆپۆلـدڤیل له سالآنی دەیەی ١٩٦٠، کۆچی بە کۆمەڵ بۆ شارەکە، بێکاریی زۆر و تەقیـنەوەیەک لە لەشفرۆشـیدا له ئەویشـەوە HIV بەرەو هایتی بەڕێکەوت کاتێک زۆرێک لە هایتییەکان کە لە لایەن دەزگـا جۆراوجۆرەکـانی نەتەوە یەکگرتووەکـان وەک یونسکۆ دامەزرابوون، کۆچی هاتن و گەڕانەوەیان دەکرد لە نێوان هەردوو وڵات، دواتـر بـۆ هەمـوو جیهـان بلآوبـووەوە. جڵەوکردنـی HIV زۆر زەحـمەتە، یەکێـک لە هۆکارەکـانی ئەوەیە، چـونکە ئەو لە تیـرەی لینتـی ڤایرۆسـی جـۆری ڕیترۆڤایرۆسە، بە هێواشی پەرەدەسەنێت لە مـاوەی درێژی هەڵهێنان لە لەشێ خـانەخوێیەکە. مـاددەی بۆمـاوەیی هەمـوو زینـدووەکان و زۆربەی ڤایرۆسـەکان، بـریتییە لە DNA، بەڵام HIV ڕیترۆڤیرۆسـە، ئەمەش واتە مـاددەی بۆمـاوەیی HIV بـریتییە لە ribonucleic acid (RNA). کاتێک HIV خانەیەک داگیردەکات، خـۆی دەگۆڕێت بۆ DNA و پاشـان ماددەی بۆماوەیی خۆی لەبەردەگرێتەوە بە شـێوەی RNA، لە ڕێگەی ئەنزیمێک بە نـاوی trancriptase enzyme لە کـاتی ئەم ئـاڵوگۆڕەدا، HIV زۆر، زۆر هەڵە دەکـات لە لەبەرگرتنەوەی خۆی، چونکە ڤایرۆسەکە دەگۆڕێت. هاوکات HIV زۆر بە خێرایی و زۆر بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو دەگۆڕێت، دروستکردنی پێکوتە قورسە_تا ئێستا سەلماوە کە ئەسـتەمە. HIV لە ڕێـگەی شـلە توشـبووەکانی لەش ڕێگـای خـۆی بـۆ نێـو لاشـە دروسـتدەکات_خوێن و تۆمـاو کـاریگەرترینن. گواسـتنەوەی سێکسـی دوو ڕەگەزی زۆر

باوتره. لەگەڵ ئەوەشدا گواستنەوەی دایک بۆ منداڵ، بەکارهێنەرانی دەرزی ناپاکژی مادده هۆشبەرەکان، کاری زایندەیی پیاو لەگەڵ پیاو هەموو ئەمانە ڕێگای گواستنەوەی گرنگن، بەڵام هەر کە گەیشتە لەش، HIV هێرش دەکاتە سەر خانەکانی CD4 سیستەمی بەرگری. ئەوەی بەتایبەتی گرنگە ئەوەیە کە HIV دوو جۆری خانەی CD4ی بنەڕەتیین بۆ ڕووبەڕووبوونەوە کە نەخۆشییەکان بە ئامانج دەگرێت: خانەی یارمەتیدەری T کە بەرگری سەرەکی جەستەن لە دژی تەنە نامۆ و نەخۆشییەکان و خانە قەبگرە گەورەکان، کە تەنی نامۆ دەگرێت و ڕێگە بە سیستەمی بەرگری دەدات بۆ ناسینەوەی ئەو تەنە هێرشبەرانە، تەنها بە توشبوون کردەی زەرداوە گۆری ڕودەدات، کە ئەو زنجیرە کردەیەیە کە دژەتەنەکانی HIV لە لەشدا گەشەدەکەن و ڤایرۆسەکە ئاشکرادەبێت. توندی توشبوونەکە بە بڕی ڤایرۆسەکە لە لەشدا دەپێورێت. کەسی توشبوو زۆرترین توانای تووشکردنی هەیە، بە ماوەیەکی کەم دوای توشبوون.HIV بە چوار قۆناغدا تێدەپەڕێت لەسەر بنەمای ژمارەی خانەکانی CD4. ژمارەی CD4 لە تاکێکی تەندروست زیاترە لە ١٠٠٠ خانە بۆ هەر ملیمەترێکی سێجای خوێن. لە قۆناغی ١ ژمارەی خانەکانی CD4 بە زۆری زیاترە لە ٥٠٠ خانە و کەسەکە بێ نیشانەیە. هەر بە گەشتنی بە قۆناغی ٢، CD4 دادەبەزێت بۆ نێوان ٣٥٠ و ٤٩٩ خانە، و نیشانەکانی وەک دابەزینی کێش و توشبوون بە کەڕوو لەوانەیە دەربکەوێت. لە قۆناغی ٣ ژمارەی CD4 بۆ خوار ٣٥٠ دادەبەزێت. کەسەکە بە توندی بەرگری لەشی تێکدەچێت و مەترسی توشبوونی دەبێت بۆ زۆرێک لە

نەخۆشـیە هەلپەرسـتەکان. ئایـدزی تەواوەتـی، کـاتێکە کە ژمـارەی CD4 لەخـوار ٢٠٠ خـانەوەیە، ئەمەش بـریتییە لە قۆناغی ٤. وەک ڤایرۆسێک، تایبەتمەندی سەرەکی HIVین، ئـالۆزییە سەرسـوڕهێنەرەکەی و توانـا فـێلاویەکەی بـۆ لەکارخسـتنی سیسـتەمی بەرگـری لەش کە بـۆ بەرپەرچدانەوەی نەخشـێنراوە.ڕەهەندە جیاوازەکانی ئایدز لەبەرچاو بگرە، بە تایبە لەلایەنی سیاسی و کۆمەڵایەتی کە جڵەوکردنـی نەخۆشـییەکە دیاریـدەکەن، هەمـوو ئەمـانە بـۆ بـارودۆخەکە زیـادبکە. توشـبوون بە HIV هەڵسـوکەوتی زایـنـدەیی لەخۆدەگرێـت، هەروەهـا ڕەگەز، هەژاری و دەستگەیشـتن بە دەرمـان و هاوکـات ویسـتی سیاسـی_یان نەبوونی. بەڵام بە هۆی ئەوەی کە گەیشتنی HIV/AIDS لە کـاتی خۆشـی گێڕانـی سـەرکەوتنی زانسـت بـوو، کاتێـک کۆمەڵگەی پزیشکی زیندەیی بەهێز هەستیان بە ئەوە دەکرد کە چارەسەری پزیشکی زیندەیی باشترینە و لە ئانووسات دایە، هەمیشـە گـرژیەک لە نێـوان لایەنـی کـۆمەڵایەتی و پزیشکی بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ پانەپەتا هەبووە.

بە گشـتی، وەڵامـدانەوەی پزیشـکی کەمتـر لە چاوتروکـانێکی خایانـد. بە تەواوی پیشەسـازییەکی زانسـتی تەواو نـوێ دروسـتکرا. پێشـکەوتنەکان لە تێگەیشـتنی نەخۆشـییەکان خێـرا و بەردەوامبـوون. لە ئەنجامـدا، نەخۆشیەکە لە نەخۆشیەکی بە نزیکەیی هەمیشە کوشندە و دەردێک دەستەوەستان لە بەرامبەر چارەسەرکردنی گۆڕدرا بـۆ نەخۆشـییەکی درێژخـایەنی بەڕێـوەبراو لە کەمتـر لە نەوەیەک. بەڵام پێشـکەوتنی پزیشـکیی زینـدەیی هەمیشـە هـاودەم نەبـوو لەگەڵ ژیـانی دەرەوەی تـاقیگە. HIV/ ئایـدز

ئێستا دەتوانرێت چارەسەربکرێت، بەڵام دەستگەیشتن بە دەرمان نایەکسانە و توشبوونی نوێش بەردەوام ئەوە نیشان دەدات کە هەوڵی پێش پێگرتن تەنها کەمێک سەرکەوتووبووە. هەر لە سەرەتای پانەپەتاکەوە وەڵامە پزیشکییەکان لەگەڵ چەندان و چەندان ئاڵانگاری بە شەڕهاتن. بۆ نموونە لە ویلایەتە یەکگرتووەکان لە سەرەتادا نەخۆشییەکە بە شێوەیەکی سەرەکی لەگەڵ پیاوانی هاوڕەگەزبازی چالاک لە ڕووی زایەندەییەوە و بەکارهێنەرانی دەرزی ماددە هۆشبەرەکان پەیوەستبوو، ترس و تۆقین و شەرمەزاری ڕەوشتی کاردانەوەی باوبوون. سیناتۆرە پارێزگارەکانی وەک جێسی هێلمس پیاوانی هاوڕەگەزبازی تاوانبارکرد: "ئایدز تۆڵەی ڕەفتاری گوناهە". بەرنامەی ئاڵوگۆڕی دەرزی، کە سوودێکی تەندروستی گشتی بەرچاوی هەیە، هەمیشە مشتومڕی لەسەر بووە، زۆرێک وا بیریان لێ دەکردەوە، کە هانی بەکارهێنانی دەرمانی نایاسایی دەدات.

زۆرێک لە ئاژانسەکانی حکومەت وەک بەڕێوەبەرایەتی خۆراک و دەرمان وا دەبینران کە خاو و بێ کاریگەرن لە پەسەندکردنی دەرمانی نوێ لە کاتی گونجاودا. لە ئەنجامدا، بزووتنەوەیەکی چالاکانی ئایدز کە نموونەیان بە ACT UP، دەرکەوت بۆ دژایەتیکردنی ڕاڕایی دەزگا حکومییەکان. بەرنامەی سێکسی سەلامەت کەوتە بەر بەرهەڵستی ئەوانەی کە داوێنپاکیان بە باشترین ڕێگا دادەنا بۆ خۆپاراستن لە ئایدز؛ هەروەها بەکارهێنانی کیفکی چووک خاوبوو لە دانانی کاریگەری بۆ ئەو پیاوانەی کە سەردانی خانەکانی لەشفرۆشیان دەکرد، هەندێک پیاو بە سادەیی

ڕەتیان کردەوە کە بە هیچ شێوەیەک بەکاریانبهێنن؛ کاتێک پەتـاکە لە ویـلایەتە یەکگرتووەکـان بەرەو ئاسـاییبوونەوە دەچوو، بەکارهێنانی کیفکی چووک کەمبووەوە. لە دەرەوەی ویـلایەتە یەکگرتووەکـان وەلامـدانەوەی نەتەوەیـی بـۆ پانەپەتاکە ئەوەندە هەمەجۆربوو کە گشتاندن شیاو نییە.

هەندێک وڵات ناچالاکبوون، لە کاتێکدا هەندێکی تر زیاتر ڕێبـازێکی چالاکیـان گـرتەبەر. کوبـا گۆشـەگیری توونـدی خسـتە سـەر ئەو کەسـانەی کە HIVیـان ئەرێنـی بـوو و پشکنینیان بۆ تەواوی وڵات ڕاسپارد. لە ئەفریقیا ئۆگاندا لە سـەرەتاوە ڕاسـتەوخۆ ڕووبەڕووی بڵاوەپەتـاکە بـووەوە و پێشـنیار و بانگەشـەی بـۆ هەڵمەتێـک کـرد بە ئامـانجی کەمکردنەوەی ژمـارەی هاوبەشـە سێکسـیەکان کە تاکەکـانی هەیانبوو. وڵاتانی تر، وەک زیمبابۆی، تەنانەت هەبوونی ئەو نەخۆشیەی لەناو سنوورەکانیدا ڕەتکردەوە.

ئەگەر ڕەچـاوی ئەو دۆلارانە بکەیـن کە خەرجکـراوە و ئەو تـــوێژینەوانەی بڵاوکـــراونەتەوە، ئەو کـــارانەی دەسـتپێکراون و ئەو سـەرکەوتنانەی کە بە دەسـتهاتوون، وەڵامـدانەوەی پزیشـکیی زینـدەیی بـۆ پانەپەتـاکە سـەروو ئاسایی بوو. بەڵام وەڵامی سیاسی و کۆمەڵایەتی کەمتربوو. چەند پزیشکێکی دیار و ناودار لە نووسینێکیاندا لە گۆڤـاری The Lancet لە سـاڵی ٢٠٠٨ی سـاڵانی سـەرەتای پانەپەتـاکە بانگەشـەی ئەوەیانکرد کە وەڵامـدانەوەی جیهـانی "دواکەوتووبووە لە زۆر شوێن، زۆر ناتەواو و پـارچەکراو و نائاهەنگبوون".یەکێک لە ناوچە هەرە فەرامۆشکراوەکان بە شێوەیەکی بەرچاو ئەفریقیابوو، کە هەر دوو خـاڵی بنەچە و ناوەندی پانەپەتـاکە بـوو. هۆکارەکـان هەمەجۆر و ئاڵۆزن و

هەم ڕەسەن و هەم ناوخۆیین. زۆرێک ئایدزیان بە نەخۆشی هاوڕەگەزبازان دادەنا، بەم شێوەیە نەنگیەکی بەرچاوی پێوەلکابوو. بەڵام شاز هەبوو: ئۆگاندا سینیگال بە ئاشکرا ڕووبەڕووی ئایدز بوونەوە، دانیان بە ئەوەدا نا کە ئایدز لە وڵاتەکانیاندا هەیە و کاریان کرد بۆ سنووردارکردنی بڵاوەپەتاکانیان بە نەهێشتنی نەنگی لەسەر نەخۆشییەکە.

لە ئەفریقای باشوور نکۆڵیکردن لە نەخۆشییەکە لە ناوەڕاستی نەوەدەکان گەیشتە لوتکە. کاتێک سەرۆک تابۆ مبێکی و وەزیری تەندروستیی کەوتنە مشتومڕکردن، دوای نکۆڵیکاری ئەمریکی پیتەر دۆسبێرگ، کە دەیوت HIV نەبێتە هۆی ئایدز و بەم شێوەیە دەرکەوتنی دەرمانی کاریگەری تازە دەرکەوتوو بێ سوود دەبێت.

ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) خاوبوو لە تێبینیکردنی نەخۆشیەکە. چوار ساڵ تێپەڕبوو بەسەر پانەپەتاکە، هافدان مهەلەر بەڕێوەبەری گشتی هێشتا ئایدزی بە پێشینە نەزانیبوو و ئەو ڕایگەیاند، " خۆ ئایدز وەک ئاگری دارستانەکان لە ئەفریقا بڵاونابێتەوە. ئەوە مەلاریا و نەخۆشیەکانی ترە کە ڕۆژانە ملیۆنان منداڵ دەکوژن"، پەتاکە لە ئەفریقا زۆر جیاوازبوو. لە ویلایەتە یەکگرتووەکان و زۆرێک لە ئەوروپا، کە زۆربەی زۆری توێژینەوەکان ئەنجامدەدران، نەخۆشیەکە زۆرترین کاریگەری لەسەر پیاوانی هاوڕەگەزباز و بەکارهێنەرانی دەرزی ماددە هۆشبەرەکان هەبوو. توێژینەوە و سیاسەتی پزیشکی زیندەیی بە زۆری سەرنجی دەخستەسەر تایبەتمەندی نەخۆشیەکە لە ئەو وڵاتانەی کە توێژینەوەکانیان تێیدا بەڕێوەدەچوو. گواستنەوەی دووڕەگەزی سەرەتا

دەگمەنبــوو، هاوکــات بە جــوڵێنەری بڵاوەپەتــاکە هەژمــار نەدەکرا. هەندێک لە ویلایەتە یەکگرتووەکان حەسانەوە کە دەرکەوت ئایدز تا ڕادەیەکی زۆر سنوورداربوو بۆ گرۆی "مەترسی بەرز"؛ شەپۆلی زەبەلاحی ئایدزی دوورەگەزی کە زۆرێک لێی دەترسان هەرگیز نەهات.

لێکەوتەکانی ئایدز بۆ ئەفریقیا زۆر گەورەبوون. لادانی گواستنەوەی دوورەگەزی بەوەی کە گرنگ نییە لە ویلایەتە یەکگرتووەکــان، واتــا پانەپەتــای هەڵچــووی ئایــدزی دوورەگەزەی لە ئەفریقیــــا دەســــــت بە بڵاوبــــــوونەوە دەکــات_ئەمەش زۆر بە کــاریگەرانە تۆمــارکراوە لەلایەن کاری پێشڕەوانەی پرۆژەی SIDA لە کۆنگۆ_لە سەرەتادا پشتگوێ خرا. ئەمەش دووبارە واتای ئەنجامنەدانی پشکنینە بۆ HIV لە ئافرەت. تا ئەو کاتەی کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی بەرنامەی تایبەتی خۆی لەسەر ئایدز دەستپێکرد (هەر زوو لە ساڵی ١٩٨٧ ناوی گۆڕی بۆ بەرنامەی جیهانی ئایدز؛ GPA)، پانەپەتاکە بە بێدەنگی بەڵام کەم تا زۆر بە ئەوپەڕی توانایەوە بڵاوبووەوە.

کاتێک بەرنامەی جیهانی ئایدز دروستبوو و جۆناپان مــان (کە پــرۆژەی SIDA لە کۆنگــۆ بەڕێــوەدەبرد و بەردەوامبوو بۆ بوون بە ئەفسانەیەک لە جیهانی ئایدزدا) بەکرێگیربوو بۆ بەڕێوەبردنی، ئایدزی جیهانی سەرنجی بێ وێنەی وەرگرت؛ بەخششەکان بۆ ڕێکخراوی تەندروستی جیهــانی زۆر بەرز بــووەوە و بەرنــامەی جیهــانی ئایــدز ســـەرکەوتوبوو لە کــارکردن لەگەڵ ئۆگانــدا، تایلەنــدیش کەمکردنەوەیەکی بەرچاوی لە گواستنەوەی نەخۆشییەکە تۆمــــاکرد و ســـــەرکەوتووانە ڕووی لە ڕێکخــــــراوە

ناحکومییەکان کرد بۆ داواکردنی یارمەتی. هەروەها GPA ئایدزی کرد بە کێشەیەکی مافی مرۆڤ لە هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەی نەنگی نەخۆشییەکە و دڵنیابوون لە ئەوەی کە تاکە توشبووەکان تووشی جیاکاری و چەوسانەوە نەبن. بۆ ماوەیەکی کەم، WHO هەوڵیدا بە بەیەکبەستنەوە بیر لە سیل و HIV بکاتەوە و زانیبووی کە HIV کاریگەریەکی بەرچاوی هەیە و دەبێت لەسەر سیل. GPA زۆر یان کەمتر بە خۆبەڕێوەبەری کاری دەکرد_کە تا رادەیەک هۆکاری شکستەکەی بووە_گەورەترین و باشترین بەرنامەی کۆمەککراوی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی.

کاتێک مەهلەر و مان لە پاییزی ساڵی ١٩٨٧ لە ئەنجومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان گفتوگۆیان دەکرد، ئەوە یەکەم جاربوو لە مێژوودا نەخۆشییەک لە بەرنامەی ئەنجومەنەکەدا دەرکەوت. ڕێکخراوی تەندروستی جیهان رابەری پێشگرتنی ئایدزبوو لەسەر ئاستی جیهانی. بەلام کاتی HIV/ ئایدز لە ڕووناکیدا ماوەیەکی کورتبوو. مان لە ساڵی ١٩٩٠ دەستی لە کار کێشایەوە، دوای ئەوەی چەندین جار لەگەڵ بەڕێوبەری گشتی هیرۆشی ناکاجیما پێکدادانیانبوو. GPA تەوژمەکەی لەدەستدا. دوای ماوەیەک کە زۆر نەبوو، ڕێکخراوی تەندروستی جیهان GPA داخست.

لە هەوڵدان بۆ پتەوکردنی چالاکیەکان لە یەک شوێن، کاری ئایدز گواسترایەوە بۆ ئاژانسێکی نوێ UNAIDS. لە سالانی گواستنەوەدا لە کۆتایی دەسەلاتی مان بۆ UNAIDS تا دەگاتە توانای کرداری_هەر چەندە بەراورد

به GPA زۆر لە خواربوو_HIV جیهانی و ئایدز بێ ڕابەر و سەرلێشێواو بەجێهێڵدران.

بە هەر حــاڵ زۆر کەس بە لایەوە گرنــگ نەبــوو، بە جۆرێک سەرنجیان خستبووە سەر بڵاوەپەتای ناوخۆیی کە هەردوو بزووتنەوەی چالاکانی ئایدز لە ئەمریکا و خودی حکومەتی ئەمریکا بە شێوەیەکی راستەوخۆ ئایدزیان لە جیهانی تازە پێشکەوتوودا پشتگوێ خستبوو. هەروەها، دڵتەزێنانە، ئەوانە هەمان ئەو ساڵانەبوون کە پانەپەتاکە بە شێوەیەکی بەرچاو لە ئەفریقا دەستی بە زیادبوون کرد. لە کاتێکدا کە ئایدز بۆ ماوەیەکی کەم سەرنجی جیهانی داگیرکردبــوو، بەڵام بە تــایبەت لە ســاڵانی ســەرەتای نەوەدەکانەوە GPA، سەرنجەکە لاوازبوو، هەر چەندە زۆرینەی حاڵەتەکان لە جیهانی تازە پێشکەوتوودا بوون، بەڵام تەنها ٦٪ خەرجی جیهانی بۆ پێشگرتنی HIV وەردەگرت، لە نەوەدەکانی سەدەی پێشوو بە هاوەڵی ئەوپەڕی خەمساردی و مەبەستی سیاسی ترسنۆکانە زۆرێک لە دەستکەوتە بەهادارەکان لە دەستچوو.

کاتێک یۆنایدس کتێبەکەی خۆی، مێژووی درێژی وەڵامدانەوەی جیهانی بۆ پانەپەتاکان بڵاوکردەوە، هیچ قسەیەکی نەخواردبووەوە و تێیدا هاتبوو: لە ماوەی دەیە و نیوێک دوای دەرکەوتنی یەکەم حاڵەت، "ڕێبەرانی جیهانی لە هەموو بەشەکانی کۆمەڵگە، بێ گوێیەکی توندیان پیشاندابوو لە بەرنگاربوونەوە و ئاڵانگاری گەشەسەندووی ئەم پانەپەتا نوێیە" بەدەر لە فەرامۆشکردنی سادە، یارمەتییە گشتیەکان بۆ وڵاتانی تازە پێشکەوتوو بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزی لە ساڵانی دەیەی ١٩٨٠ و بۆ ساڵانی دەیەی ١٩٩٠.

ئاژانسەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان وەک ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی نارەحەتیان چەشت کاتێک نەتەوە بەخشەرەکانی وەک ویلایەتە یەکگرتووەکان لە ماوەی دەسەلاتی ڕیگان ڕەتیانکردەوە کە ئابونە بدەن (هەر چەندە بۆ ماوەیەک GPA جیاوازبوو، چونکە پاڵپشتیەکی تایبەتی وەردەگرت). سیاسەتی ئابووری لیبڕاڵی نوێ ولاتانی ناچارکرد بۆ پەسەندکردنی شێوازی ژیانی سک هەلگوشین بۆ ئەوەی قەرزە گەورەکانی خۆیان بدەنەوە. HIV/ ئایدز دەستیکرد بە دانانی کاریگەریەکی گەورە لەسەر ئابووریەکان هاوکات لەگەڵ کاریگەریەکانی بەرنامەکانی هەموارکردنی پێکهاتەی دەولەتی بانکی نێودەولەتی کە بەردەوامبوو لە هەڵلوشینی یەدەگی ئەو ولاتانەی کە لە بنەڕەتدا خۆیان لاواز و زەبوون بوون، لە کاتێک کە ولاتەکان خۆیان لە ئەو پەڕی پێویستیدا بوون پێی، بۆیە کاریگەرییەکان سەرسوڕهێنەربوون.

یەکێک لە ئەنجامەکان، کۆمەککردنی چاودێری تەندروستی بە تەواوەتی کەمبووەوە؛ زۆرێک لە ولاتانی ئەفریقی کرێی بەکارهێنەریان سەپاند لەسەر چارەخوازان، کرێیەک کەم نەخۆش توانیان بیدەن. لە ماوەی ئەم سالانەدا، بانکی نێودەولەتی گرنگی بەدەستهێنا، لە کاتێکدا کە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە دەستیدەدا. دەستپێک لە سالی ١٩٨٧، هەمان سال GPA کرایەوە، بانکەکە دەستیکرد بە تەرخانکردنی پارەی زیاتر و زیاتر بۆ بەرنامەکانی تەندروستی لەسەر بنەمای لیبرالی نوێ کە واتای ئەوە بوو، لە نێوان شتەکانی تردا دەستێوەردانی تەندروستی لەسەر بنەمای شیکردنەوەی کاریگەری تێچوون هەڵدەسەنگێندرێت؛

هەروەها واتای ئەوە بوو کە بودجەی تەندروستی گشتی چەندین وڵات بە توندی دادەبەزێت.

لەگەڵ وەرگرتنی دەورێکی گەورەتر و گەورەتر لە لایەن بانکەکەوە لە تەرخانکردنی کۆمەکی بەرنامەکانی تەندروستی، بە شێوەیەکی سروشتی کاریگەری زیاتر و زیاتری لەسەر شێوازی ئەو بەرنامانە پەیداکرد. یەکێک لە کاریگەرە بەهێزەکان بینینی دەستێوەردانەکانی نەخۆشی بوو لە ڕووی کاریگەری تێچووەوە.

ئەم شێوازە نوێیە لە دانانی پێشینە بۆ بەرنامەکان یەکەم جار لە ڕاپۆرتی گەشەپێدانی جیهانی ساڵی ١٩٩٣ بانکی نێودەوڵەتی دەرکەوت: کە وەبەرهێنان لە تەندروستیدا، ئاماژەی بۆ جیهان کرد، بەپێی سەر وتارێکی گۆڤاری The Lancet، کە ئاڵوگۆڕێک ڕوویدا لە "سەرکردایەتی لە تەندروستی نێودەوڵەتی لە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیەوە بۆ بانکی نێودەوڵەتی" بانکەکە بەدوای ئەوەدابوو کە دەستنیشانیبکات (و ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی شوێنی کەوت) کە چ نەخۆشیەک زۆرترین کاریگەری نەرێنی هەبوو لەسەر ئابووری_پێوانە دەکرا بە ئەوەی کە پێی دەوترێت DALYs (ساڵەکانی ژیان هەموارکراو بە پێی کەم ئەندامی) هەروەها ئەو نەخۆشیە دەبێت تا ڕادەیەک هەرزان بێت بۆ چارەسەرکردن. بە هەر پێوەرێک بێت، بەپێی ئەو هەژمارکردنانەی کە لە ئەم جۆرە بابەتانەدا هەیە، چارەسەرکردنی ئایدز هیچ کاریگەر نەبوو لە ڕووی تێچووەوە. هەروەها لەبەر ئەوەی کە چینی تازەی دەرمانی دژە ڤایرۆس گرانبوو، بۆیە لە وڵاتانی کەم داهاتدا لە ڕووی تێچووەوە کاریگەر نەبوو. هەندێک لە هەوڵەکانی

پێشــپێگرتنی HIV، وەک کیفــی چــووک (کۆنــدۆم)، کە لە ڕووی نرخەوە بە کاریگەر دادەنرێت، بەڵام زۆر قورسبوون بۆ جێبەجێکردن.بە ئەم شێوەیە وڵاتانی تازە پێشکەوتوو لە بارودۆخێکدابوون کە سەیر و تەنانەت مایەی گاڵتەجاڕی بــوو: بــاکووری جیهــان وەکــو ئەوەی هەنگــوینی لە دار دۆزیبێتەوە هەر کە هەوڵەکانیان بۆ چاککردنی تەکنەلۆژیا لە ئاسۆدا ڕوون بوو_چارەسەری دژە ڤایرۆسی زۆر چالاک (HAART)، باشووری جیهان لە لایەن باکووری جیهانەوە پێی وترا کە ناتوانێت دەستیبکەوێت؛ چونکە زۆر گرانە. کەمتر لەسەری دەکەوێت لە سەرقاڵبوونی بە کارکردن لەســـەر پێشــپێگرتنی HIV. هەمـــان ئەو پێداویســـتیە ئابووریانەی کە وای لە ویلایەتە یەکگرتووەکان کرد کە جەخت بکاتە سەر چارەسەری پزیشکی زیندەیی بۆ پشتگوێ خستنی دەستێوەردانە کۆمەڵایەتیەکان، ئێستا ڕێگری دەکات لە دەستێوەردانی کاریگەری پزیشکی زیندەیی بۆ گەشتن بە ئەوانەی کە زۆر پێویستیدارن.

دەیەی نەوەدەکان دەیەی فەرامۆشکردن و لە دەستدانی هەلەکان بوو. وەڵامی سیاسی جیهانی بۆ ئایدز لە ساڵانی دەیەی ١٩٩٠ ندا بەسبوو. بەڵام هەمان شت ناتوانرێت سەبارەت بە پزیشکی زیندەیی بوترێت. لە ساڵی ١٩٩٥ و ١٩٩٦ دوو پۆلی نوێی دەرمانی دژە ڤایرۆس دۆزرانەوە و تاقی کرانەوە و بڵاوکرانەوە: یەکەمیان پۆلی protease inhibitors، یەکەم دەرمان saquinavir، و پاشان پۆلی protease inhibitors، یەکەم دەرمان nevirapine. لە یازدەهەمین کۆنفرانسی نێودەوڵەتی ئایدز لە ڤانکۆڤەر توێژەران ڕایانگەیاند، کە کاتێک دەرمانی ئەو دوو پۆلە

جیاوازە بە تێکەڵەیەکی سێ قۆڵی بەکارهێنران، ڤایرۆسەکە دەتوانرێت سەرکوت بکرێت و سیستەمی بەرگری نەخۆشەکە بگەڕێنرێتەوە. ئەو نەخۆشیەی کە جاران وەکو بڕیاری لە سێدارەدان وابوو، چیتر کوشندەنەبوو. یەکێک لە ئەو دەرمانانە، nevirapine، نەک تەنها یارمەتی ئەوانەی دەدا کە نەخۆشی ئایدزیان هەبوو، بەڵکو دەیتوانی ڕێگری لە گواستنەوەی بۆ کۆرپەلە بکات. گواستنەوەی دایک بۆ کۆرپەلە کێشەیەکی ئاڵانگاربوو، بەڵام پێدانی دەرمانی nevirapine بە دایک کەمێک پێش لە دایکبوون و منداڵەکەش دوای ئەوە کاریگەرییەکی بەرچاوی لەسەر ئەم ڕێگایەی گواستنەوە دەبێت.

لە ئەو شوێنانەی کە دەست گەیشتن بە دەرمانەکە گەورەترین ئاسان بووە، ڕێژەی گواستنەوەی دایک بۆ منداڵ بە شێوەیەکی بەرچاو دابەزیوە. دڵتەزێنانە، nevirapine لە دەرەوەی نۆڕینگەکانی پێش لەدایکبوون لە ئەنتناتاڵی ئەفریقای باشوور هێڵدرایەوە تا ساڵی ٢٠٠٢ کە دادگای دەستووری، دەستێوەردانی کرد بۆ ئەوەی بەردەستیانبکات، ئەمەش بەهۆی باوەڕی تابۆ مبێکی کە HIV نەبووەتە هۆی ئایدز. لەگەڵ هاتنی ئەو دەرمانە نوێیانە دەکرا کە ئایدز ببێتە نەخۆشییەکی درێژخایەنی بەڕێوەبراو، بە ئەم شێوەیە ڕێڕەوی پانەپەناکە دەگۆڕێت. بەڵام ئەو دەرمانانە زۆر گرانبوون_بۆ زۆر کەس بەربەستبوو. ساڵانە ١٠٠٠٠ دۆلار بۆ ١٥٠٠٠ دۆلار تێچوویان بوو و پێویستبوو بە درێژایی ژیان وەربگیردرێن. هەروەها دڵنیایی لە بە دەستگەشتنی خێرا زۆر گرنگبوو. لە هەمان کاتدا، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا مردن بە هۆی هۆکارەکانی پەیوەندیدار بە ئایدز، لە کۆتاییەکانی ساڵانی دەیەی ١٩٩٠

دەستی بە دابەزین کرد، تەنها لە نێوان ساڵانی ١٩٩٦ و ١٩٩٧، بۆ ٤٦٪ دابەزی. بڵاوەپەتای نێوخۆیی کەمتر بارودۆخی لە ناکاوبوو و پانەپەتای نێودەوڵەتیش بەردەوام لە فەرامۆشکردندابوو. ئەوەشی بۆ زیاد بکە، مشتومڕی هەندێک لە سەرکردایەتی تەندروستی جیهانی کە چارەسەرکردنی ئایدز لە جیهانی تازە پێشکەوتوو نە لە ڕووی نرخەوە کاریگەر دەبێت و نە گونجاوبوو لەبەر نەبوونی ژێرخان.

دوو وتار لە گۆڤاری Lancet The ئەم بانگەشەیەیان کرد. یەکێکیان بانگەشەی ئەوەی کرد کە "زانیاری لەسەر کاریگەری تێچووی پێشپێگرتنی HIV لە ولاتانی باشووری بیابانی گەورەی ئەفریقا و لەسەر چارەسەری دژە ڤایرۆسی زۆر چالاک ئاماژە بە ئەوە دەکات کە ڕێگریکردن لانی کەم ٢٨ جار لە HAART کاریگەرترە." ئەوی تر وتی: "زۆرترین تێچووی دەستێوەردان بۆ پێشپێگرتنی نەخۆشی ئایدز و چارەسەری نەخۆشی سیل بووە، لە کاتێکدا HAART بۆ کەسانی پێگەشتوو، و چاودێریی نێو ماڵ ڕێکخراو لە لایەن دەزگا تەندروستیەکانەوە، کەمترین کاریگەری هەبووە لە ڕووی تێچووەوە" وا دادەنرا کە چارەسەرکردن و پێشپێگرتن هەردوو سەرەخۆرەی یەکتربن. لە ئەو جیهانەی کە ئایدز زۆرێک ئیشیان تێدادەکرد، وا بیردەکرایەوە کە ئەم جۆرە هەڵبژاردنە زبرانە پێویستبن.

هەروەها سەرۆکی USAID بە ئەنجومەنی نوێنەرانی ئەمەریکای ڕاگەیاند، ئەفریقیەکان بە گشتی ناتوانن ئەو جۆرە دەرمانانە وەربگرن، تەنانەت ئەگەر بەردەستیش بن، چونکە لەگەڵ هۆکارەکانی تردا ئەفریقیەکان کاتژمێر لەدەستناکەن و شێوازی کاتەکانیان جیاوازن و بە ئەو

شێوەیە ناتوانن پابەندبن بە خشتەی چارەسەرکردن. بەڵام دواتر ئاڵوگۆڕێکی بنچینەیی ڕوویدا. سەرەتا لە دەوری نۆرەی هەزارەی سێیەم ڕێگایەکی نوێ بۆ بینینی پانەپەتاکە دەرکەوت. تەندروستی جیهانی بووە پێشینە بۆ حکومەتی ویلایەتە یەکگرتووەکان و خێرخوازە گەورەکانی وەک دامەزراوەی بیل و میلیندا گەیتس بۆ نموونە، لە ساڵی ٢٠٠٠ ویلایەتە یەکگرتووەکان پارەی چارەسەری دژە ڤایرۆسی (ART) بۆ زیاتر لە چەند سەد نەخۆشێک لە جیهاندا دابینکرد؛ لە مانگی ئەیلولی ٢٠٠٩ وەزارەتی دەرەوە بانگەشەی ئەوەی کرد کە ویلایەتە یەکگرتووەکان چارەسەری دژە ڤایرۆسی (ART) دابیندەکات بۆ ٢.٥ ملیۆن کەس. چی ئەم گۆڕانکاریە لە پارەدان و سیاسەتی دەرمان ڕوون دەکاتەوە؟ بۆ زۆربەی ساڵانی دەیەی ١٩٩٠ دەرمانی هێڵی دووەم بۆ سیلی بەرهەڵستکاری دەرمان و چارەسەری دژە ڤایرۆسی (ART) زۆر گران بوون. زۆرێک لە تەندروستی جیهانی ئەمەیان سەیردەکرد وەک تەنها پارە پەیداکردن نەک دامەزراوەی مرۆیی. لە سەرەتای ساڵانی دەیەی ١٩٨٠، ACT UP پێشەنگی چالاکی ئایدز بوو کە سەرنجی خستەسەر دەستگەشتن بە چارەسەر. لە کۆتایی نەوەدەکان نەوەیەکی نوێ لە چالاکوانان لە ئەفریقای باشوور دەرکەوتن و داوای دەستگەشتنیان دەکرد بە دژە ڕیترۆڤایرۆسەکان و وەڵامدانەوەی زنجیرەیەک پرسیاری قورس: واتای چییە کە بڵێین دەرمانەکان زۆر نرخ گرانن؟ کێ بڕیاردەدات؟ کێ نرخەکان دادەنێت؟ بۆ چالاکوانان وەڵامەکە ئەوەبوو کە ئەگەر نرخە بەرزەکان لە لایەن خەڵکەوە دابنرێت، ئەوا دەکرێت ئەوانیش دایبەزێنن و ئەگەر تێچووی دەرمانەکان کەم ببووایە، ئەوا مشتومڕەکان

دەربارەی ئەوەی کە ئەوان لە ڕووی نرخەوە کاریگەرنین ون دەبێت.




**٩. لە ماوەی سالانی دەیەی ١٨٨٠ و ١٩٩٠، ACT UP سەرنجی خستەسەر ئەوەی کە زۆرێک وەکو کەمتەرخەمی ویلایەتە یەکگرتووەکان بۆ وەلامدانەوەی ئایدز سەیریاندەکرد.**

شتەکان لە زۆر لایەنەوە بڵاوبوونەوە و ڕوویاندا، توێژینەوەکان دەستیانکرد بە دەرکەوتن بۆ بەرەنگاربوونەوەی بانگەشەکانی پابەندنەبوون و ئەو بۆچوونانەی کە پێشگرتن و چارەسەرکردنیان بە سەرەخۆرەی یەکتر دادەنا. دوو لێکۆڵینەوە لە ڕۆڵی سنووررداری HARRT دەرکەوت لە ساڵی ٢٠٠١، یەکێکیان لە هایتی هاتە دەرەوە و ئەوی تریان لە خەیلیتشا، لە دەرەوەی کیپ تاون_کە دەریخست خەڵک لەسەر چارەسەرەکانیان ماونەتەوە. لە لێکۆڵینەوەکەی کیپ تاون زاناکان زیاتر فێربوون: لەگەڵ زیادبوونی بەردەستی

چارەسەر، زیاتر و زیاتر خەڵک بەدوای تاقیکردنەوەیدا دەبن. واتە کاتێک خەڵک بینی کە چارەسەرێکی کاریگەر هەیە، زیاتر و زیاتر بەدوای خزمەتگوزاریەکانی ئایدزدا دەگەڕێن. هەر ئەوەی کە خەڵک زیاتر دۆخی خۆیان دەزانی، و زیاتر دەستیانکرد بە وەرگرتنی چارەسەر، ئەمەش گواستنەوە کەم دەکاتەوە. بە ڕوونی، HAART دەتوانێت کاربکات لە بارودۆخی کەمی سەرچاوە، بەڵام دەرمانەکان هێشتا نرخیان زۆر گرانە. لە هیندستان و بەڕازیل، بەرهەمهێنەرانی دەرمان دەستیانکرد بە بەرهەمهێنانی وەشانێکی هەرزانتر لە دەرمانی دژە ڕیترۆ ڤایرۆسی بازرگانی، بەڵام لە هەموو جیهاندا مافی داهێنان ڕێگربوو لە دروستکردنی دەرمان بە شێوەی بازرگانی، چونکە کۆمپانیاکانی دەرمانسازی لە لایەن ئەمریکا و ڕێکخراوی بازرگانی جیهانییەوە هاوکاری دەکران. بەڵام ئەوان کاریان بۆ ئەوە کرد کە دەرمانی بازرگانی لە دەستی جیهان بە دووربگرن. لە ساڵی ١٩٩٧ ئەفریقای باشوور هەوڵیدا بە تێپەڕاندنی یاسای دەرمانەکان بەرەنگاری ئەمە بکاتەوە کە تێیدا ڕایگەیاند لە حاڵەتی لە ناکاوی تەندروستی گشتی وەک ئایدز ئەو وڵاتە ڕێگە پێدراوە بۆ هەردوو هاوردەکردن و بەرهەمهێنانی وەشانی بازرگانی دەرمان کە هێشتا تایبەتمەندی داهێنەر تێیدا پارێزراون.

لە بانگەشەی ئەوەی کە یاساکە مافی خاوەندارێتی فکری پێشێل کردووە، لە ساڵی ١٩٩٨ سی و نۆ کۆمپانیای دەرمان لە دادگای ئەفریقای باشوور کاردانەوەیان پیشاندا بە بەرزکردنەوەی داوا لەسەر دەوڵەت. چالاکوانان، بەتایبەتی هەڵمەتی چالاکی چارەسەریی، باس لە ئەوە دەکەن کە

تێچووی دەرمانەکان زۆر دوورن لە ڕێژەی لێکۆڵینەوە و پەرەسەندنەکانیان، هیچ مەڵێ لەسەر بیانووی مرۆیی بۆ بەردەستبوونی چارەسەرەکان.

بەڕێوبەرایەتی کلینتۆن پشتیوانی لە دەرمان دروستکەرەکان کرد، کە تا ئەو ئاستە ڕۆشت کە ئەفریقای باشوور بخاتە نێو "لیستی چاودێریەوە"_پێشەکی سزاکانە_کە ئاماژەی بۆ ئەگەری لابردنی "مافی داهێنەر" لە یاسای دەرمان دەکرد. کاتێک ئەل گۆری جێگری سەرۆک کۆمار بەربژێری خۆی بۆ سەرۆکایەتی ڕاگەیاند، لەناکاو خۆپیشاندەران لە پشتەوە دەرکەوتن بە لافیتەی "چاوچنۆکی گۆری دەمانکوژێت! دەرمانی ئایدز بۆ ئەفریقا!" ناڕەزایەتی لە زۆر شوێنی تر قلیشایەوە. لە ماوەی سێ مانگدا حکومەتی ئەمریکا ڕێڕەوی خۆی پێچەوانە کردەوە: ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا فشار ناخاتە سەر هیچ وڵاتێک بۆ کڕینی تەنها دەرمانی نیشانکراو، ڕێگە بە هاوردەکردنی دەرمانی بازرگانی دەدات. تا مانگی نیسانی ٢٠٠١ هەر سی و نۆ کۆمپانیاکەی دەرمان داواکانی خۆیان لە دادگا خست. دەرگاکە ئێستا کراوە بوو بۆ دەرمانە بازرگانیە هەرزانەکان بۆ پڕکردنەوەی بۆشایی لە چارەسەردا.

هاوشانی گۆڕانکاری لە سیاسەتی دەرماندا زیادبوونێکی زۆر لە پارەداندا هات و یەکێک لە گەورەترین کۆمەککەرەکان هەروەها یەکێک لە گەورەترین سەرسوڕهێنەرەکان بریتیبوو لە پلانی فریاگوزاری سەرۆک بۆ یارمەتیدانی ئایدز (PEPFAR) کە لە ٢٨ مانگی کانوونی دووەمی ساڵی ٢٠٠٣ ڕایگەیاند. لە ماوەی سەرۆکایەتی جۆرج دەبلیو بۆش لە وتاری بەردەم کۆنگرێس. بۆش وتی: دەکرێت ڕێگری لە ئایدز بکرێت. دەرمانە دژە ڤایرۆسەکان دەتوانن تەمەنی توشبووان بۆ چەندین ساڵ درێژ

بــــکەنەوە....کەم هەبـــووە لە میــــژوو هەلێکـــی گەورەی ڕەخساندووە بۆ پێشکەشکردنی ئەو هەموو خزمەتگوزارییە بەو هەموو کەسە....بۆ ڕووبەڕوونەوەی ئەو قەیرانە سەخت و لەناکـاوەی دەرەوەی وڵات، ئەمشـەو پێشـنیاری پلانـی فریاکەوتن دەکەم بۆ یارمەتیدانی ئایدز، کاری میهرەبانانەیە کە هەمـوو هەوڵە نێودەوڵەتیەکـانی ئێسـتا بـۆ یارمەتیـدانی خەڵکی ئەفریقا تێدەپەڕێنێت.... داوا لە کۆنگریس دەکەم کە لە مـاوەی پێـنج سـاڵی داهـاتوودا ١٥ مليـار دۆلار بـۆ ئەم مەبەسـتە تەرخانبکـات. هەروەهـا لەگەڵ نزیکەیـی ١٠ مليـار دۆلار لە پـارەی نـوێ، بـۆ گـۆڕینی تەوژم لە دژی ئایـدز لە تووشبووترین نەتەوەکانی ئەفریقا و دەریای کاریبی.*



١٠. خۆپیشاندەرانی هەڵمەتی کردەی چارەسەرکردن داوای دەستگەشتنی بێ بەرامبەر دەکەن بۆ دەرمانە ژیان_پارێزەکان لە شەقامەکانی شاری دوربان، باشووری ئەفریقا، لە تەموزی ساڵی ٢٠٠٠. ئەم وێنە کاریگەرە وێنەدانەوەی هەستکردنی خەڵکە بۆ نەخۆشییەکە و بێچارەیی قوربانیە 'ئەفریقیەکان'.

بەرنامەی PEFAAR ئامانجی ئەوە بوو کە بە خێرایی دەستگەیشتن بە چارەسەرەکانی دژە ڕیترۆ ڤایرۆس بەدیبهێنێت، کە وێنای سەرجەم بەشەکان کرا، پاش ئەوەی کارەکە لە ئۆگاندا ئەنجامدرا. لە ناوەڕاستی دەیەی یەکەمی سەدەی نوێدا تێکەڵەیەک لە هۆکارەکان ڕووی دەرماڵە و چارەسەری ئایدزیان گۆڕی: نزمتربوونی نرخی دەرمان، زیادبوونی بەڵگەی کاریگەری چارەسەر لە بارودۆخەکانی کەمی سەرچاوە، چالاکی خەڵکی و سەرچاوە نوێیەکانی پارەدان وەک PEPFAR. هەر چۆنێک بێت، دەستگەیشتن بەدەرمان بە ناڕێکی مایەوە و توشبوونی نوێ واتای فراوانکردنی بواری دەستگەیشتن دەبێت، ئەگەر بڕیار وایە پانەپەتاکە بوەستێنرێت.

سەرچاوەکانی دەرماڵە ناجێگیربوون. نەنگی و نەبوونی تێگەیشتن هێشتا ڕێگربوو لە پێشکەوتن. تەنانەت لە ویلایەتە یەکگرتووەکان چالاکوانان و خۆپیشاندەران دەستگەیشتن بە چارەسەری بێ مشتومڕیان بەشێوەیەکی توند ڕاگەیاند. ژن و پیاوی ئەمریکی ئەفریقی لە شوێنەکانی وەک واشنتنی پایتەخت ڕێژەی تووشبوونیان زۆر لە ژمارەی دانیشتوانی سپی پێست زیاتربوو_ ٧٥٪ حاڵەتی نوێ لە ساڵی ٢٠١٣ لە نێو دانیشتوانی ڕەش بوو؛ بە هەمان شێوە، ٧٥٪ ئەو کەسانەی کە لەگەڵ نەخۆشی ئایدز دەژین ڕەشن. لە ماوەی سەرهەڵدانی نەخۆشی ئایدز لە نێوان بەکارهێنەرانی دەرزی مادده هۆشبەرەکان لە ناوچە لادێییەکانی ئیندیانا لە ساڵی ٢٠١٥، ئەو ڕونبووەوە کە نەنگی هێشتا کێشەیەکی سەرەکی بوو کاتێک هەندێک لە ئالودەبووەکان ڕەتیان کردەوە کە پشکنینیان بۆ بکرێت، چونکە ترسی ئەوەیان هەبوو وەک

هاوڕەگەزباز ئاماژەیان بۆ بکرێت ئەگەر ببینرێن کە لە نۆڕینگەکانی ناوچەکە دێن و دەچن؛ زۆر کەس نەیاندەزانی چارەسەر بەردەستە، یان دەربارەی مەترسییەکانی دەرەنجامەکانی هاوبەشی کردنی دەرزی مادده هۆشبەرەکان.

HIV/ئایدز تەندروستی جیهانی بە شێوەیەکی بنەڕەتی گۆڕی: بزووتنەوەیەکی بنەڕەتیی و زیندووی چالاکوانان تەرەکین و ئەو ڕێگایانەیان گۆڕی کە دەستگەشتن بە دەرمان و نرخەکەی پێ دیاری دەکرێت، هەروەها جەختیشیان لەسەر پەیوەندی نێوان تەندرووستی و مافی مرۆڤ دەکردەوە. هەروەها پانەپەتاکە ئەوەی ڕوونکردەوە کە ئێمە هەرگیز لە جیهانێکی بێ نەخۆشیدا ژیان ناکەین. هەروەها بەبیری هێنایەوە کە ئێمە لە جیهانێکی هەلی جیاواز و دەست گەشتنی جیاواز دەژین_ئەو ڕاستییەی کە دەبێت ئەو برە زۆرەی نەخۆشی ئایدز لە جیهانی تازە پێشکەوتوو بەتەواوەتی ڕوونبکاتەوە. هەروەک لەگەڵ نەخۆشییە پەتاییەکانی تر، باری جیهانی نەخۆشی ئایدز لەسەر ئەو کەسانەیە کە کەمترین توانایان بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەیە.

## کۆتایی

ئێمە چی بکەین لەگەڵ ئەم مێژووە؟ ئایا ئەم هەموو ئەزموونەی ڕابردوو، هەموو ئەم مێژووە، ئێستا ئاگادار دەکاتەوە؟ بەڵێ و نەخێر. لە بەهاری ساڵی ٢٠١٥، ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) بەیاننامەیەکی بڵاوکردەوە و دانینا بە کاردانەوە کەمتەرخەمەکەی بۆ پانەپەتای ئیبۆلا و هەوڵیدا سەرنج بۆ ژمارەیەک لە "وانە فێربووەکان" ڕابکێشێت. ئەوە بەڵگەنامەیەکی سەرسوڕهێنەربوو. سەرسوڕهێنەربوو کە لە ساڵی ٢٠١٥ لە نێو وانەکانی فێربووندا شتی وەک "وانەکانی کۆمەڵگا و کەلتوور" هەبوون. سەیرە کە پێویستی بە ئیبۆلا کرد بۆ پیشاندانی بەهای خەڵکی نێوخۆیی و زانیاریەکانیان. ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) "فێربوو دەربارەی گرنگی توانا"_واتە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO)، فێربوو کە جیهان توانای چارەسەری بڵاوەپەتاکانی نییە. ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) "ئەوەی بەبیرهێنایەوە کە سیستەمەکانی دانراو لەسەر بنەمای ئابووری یارمەتی ناگەیەنن بە نەخۆشییە پشتگوێخراوەکان."

بۆچی پێویستی بە ئیبۆلا کرد بۆ ئەوەی ئەو ڕاستیە گرنگە دووبارە فێرببێتەوە؟ هەروەها ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی زانی کە دەستکەوتەکان لە شتەکانی وەک جڵەوکردنی مالاریا یان ژنانی ڕزگاربوو لە منداڵبوون دەشێت پێچەوانە ببێتەوە، کاتێک "لەسەر سێستەمێکی تەندرووستی لاواز بنیاتنرابێت" ئایا بە ڕاستی دەکرێت پێش ساڵی ٢٠١٥ ئەم وانەیە فێرنەبووبێت؟

مـن حەزم لە تۆمەتبـارکردنی ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـانی نیـیە_کە لەم دۆخەدا ئامـانجێکی ئاسـانە_و جێـی ستایشـــە کە ســـەرکردایەتی دان بە هەڵەدا دەنێـــت، بەڵام ڕێکخـراوی تەندروسـتی جیهـان بـۆ باشـتر یـان خراپتـر، نوێنەری شێوازێک بۆ بینینی شتەکان لە جیهانی تەندروستی جیهانیـدا، و لێدوانەکەی سـەرکردایەتی لەسـەر وانەکـان کە فێربـوون ڕێـگەم پێـدەدات خاڵێـک ڕوونـبکەمەوە: هەمـوو وانەیەک کە فێربـووی (یـان لە یەک حاڵەتـدا کە دووبـارە فێربووەتەوە) دەکرا لە سەیرکردنێکی ڕابوردوو بچنرێتەوە. ئەم وانـانە تـازەنین، مێـژووی بڵاوەپەتـا و پانەپەتاکـان بـۆ چەنـدین سـەدەیە فێریانـدەکات، ئەوەی کە وا دیـارە هـیچ ئاگـاییەکی مێژوویـان نیـیە نائومێـدکەرە، نەک تەنهـا لەبەر ئەوەی من مێژوونووسم.

ئەوە نائومێـدکەرە، چـونکە هەوڵەکانیـان بەفیـڕۆدان و ناکـاران. هەروەهـا لەخۆبـایی و سـاویلکەن_ئای چەنـد تێکەڵەیەکـی کوشـندەیە. سـاویلکەییە وا بیـربکەینەوە کە بە سـادەیی فێربـوونی وانەکـان داهـاتوو جیـاواز دەکـات و لەخۆباییبوون دەبێت ئەگەر وا دابنێین کە ئەوانەی ڕاشکاون لە وتنـی "هەڵەی مـن بـوو" ئەو ڕۆشـنبیرانەن کە لە کۆتاییدا هەڵەکانی ڕابردوو دەبینن. پێویستە ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی و ئەوانی تر پرسیار بکەن: ئایا سەرچاوەی خودی ئەو هەڵانە چین؟

ئەوەی کە ئەو هەڵانە بەسـەردا نەهـاتوون و لەخـۆوە نەبوون، بەڵکو ئەنجامدراون گرنگە، بەڵام هۆکـاری ئەوەی کە بـۆچی کـراون لەوانەیە گرنگتربێـت. پانەپەتاکـان تەواو نـابن. هـیچ گومانێـک نـیە کە لە داهـاتوودا پانەپەتـا زۆرتـر

دەبێت. لەوانەیە پانەپەتا لە دوژمنێکی کۆن و ئاشنای وەک ئەنفلۆنزا یان لە سەرچاوەیەکی نوێ دەربکەوێت_لەوانەیە نەخۆشییەکی مرۆئاژەڵی بێت کە ڕێگای خۆی بۆ توشکردنی مرۆڤ خۆشکردبێت. جیهان لە داهاتوودا چۆن ڕووبەڕووی پانەپەتاکـــــان دەبێــــــتەوە؟ ئەگەری ئەوە زۆرە کە ئەو شـێوازانەی لە مێـژە دامەزراون دووبـارە سـەرهەڵبدەنەوە. بەڵام چۆن ئالانگارییە نوێیەکان، وەک گۆڕانی کەشوهەوای جیهـانی، کـاریگەری دەبێت لەسـەر پانەپەتاکـانی داهـاتوو و توانای وەڵامدانەوەمان بۆیان؟

ئەگەری ئەوەی کە بە گەرمبـوونی کەشـوهەوا، مێشـوولە هەڵگرەکانی نەخۆشی لە شوێنی نوێ نیشتەجێببن. ڤایرۆسی زیکا بە نمـوونە وەربگرە، کە لە لایەن مێشـوولەی Aedes aegypti هەڵدەگیرێت_بە گشـتی بە مێشـوولەی تـای زەرد ناو دەبردرێت_لە سەرەتای سـاڵی ٢٠١٦ لە ئەمریکـای لاتین و ناوچەکانی دەریای کـاریبی تەقییەوە هەر کە پلەی گەرمـا بەرزتـرین ژمـارە تۆماردەکـات و مێشـوولەی Aedes aegypti نیشینگەی گونجاوی دۆزییەوە. لەوانەیە کە پلەی گەرمـا لە هەر شـوێنێکی تـر بەرزبێـتەوە، بەمەش زیکـا نیشـینگەی زیـاتر لە بـاکوور دەدۆزێـتەوە. بەرزبـوونەوەی پلەی گەرمی ئاو لەوانەیە شوێنی زیاتر بۆ کۆلێرا دابینبکات. هەروەهـا تـوێژینەوەی زیـاتر و زیـاتر پێشـنیاری پەیوەنـدی نێـوان بەرزبـوونەوەی مـاوە مـاوەی پلەکـانی گەرمـا لە ناوەڕاستی ئاسیا و گەیشتنی تـاعوون دەکەن بـۆ ئەورووپـا لە کۆتاییەکانی سەدەکانی ناوەڕاست، ئەوە بـۆ خۆمـان باشـترە گرنگی زیـاتر بدەین بە نمـوونە مێژووییەکـانی دیکەی نێوان گـۆڕانی کەش و هەوا و نەخۆشـی لە داهـاتوودا، ڕێکخـراوە

ناحکومیەکانی وەک پزیشکانی بێ سنوور_ئەو گرۆیەی کە زۆر قارەمانانە و ماندوو نەناسانە وەڵامی ئیبۆلایان دایەوە کاتێک کە جیهان تەنها سەیریدەکرد، ئایا وەک یەکەم لایەنی وەڵامدەرەوە پشتیان پێ دەبەسترێت؟ یاخود ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی هەندێک لە پێگە لەدەستچووەکەی خۆی بەدەستدەهێنێتەوە؟

یەک شت ڕوونە: لە بەرامبەر پانەپەتایەکی مەترسیداردا زۆربەی ژێرخانی تەندروستی گشتی جیهانی تازە پێشکەوتوو بە شێوەیەک بارگران دەبێت کە جێگای بەزەیی دەبێت.

یەکێک لە ڕێگا دڵنیاکان بۆ ئاسانکردنی ئەو ئازارانەی کە لە هەر پانەپەتایەکی داهاتوودا تووشی دەبین، وەبەرهێنانە لە دروستکردنی ژێرخانێکی تەندروستی گشتی بەهێز لە هەر شوێنێک کە پێویست بێت. کاریگەری پانەپەتا و بڵاوەپەتا زۆر خراپتر دەبێت لەو شوێنانەی کە کەمترین توانای وەڵامدانەوەیان هەیە. هەر چەندە لەوانەیە ئەمە هەستێکی ئاسایی بێت، بەڵام ئەوە ڕوونە لە "وانەکان کە فێربوون" لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی لە کاتی پانەپەتای ئیبۆلا کە هێشتا بە شێوەیەکی ئاسایی لە بیردەچێتەوە.

لە ساتەوەختی پانەپەتای ئەنفلۆنزای H1N1 لە ساڵی 2009، مشتومڕێک دروستبوو، دەربارەی ئەو پێناسەیەی پانەپەتا کە لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی(WHO) و ئەوانی دیکەوە بەکاردەهات، لە ئەنجامدا چەند پسپۆڕێکی نەخۆشیە گوێزراوەکان لە پەیمانگای نیشتمانی هەستیاری و نەخۆشییە گوێزراوەکان سەر بە پەیمانگای تەندروستی نیشتمانی(NIH) گەشتن بە چوارچێوەیەکی گشتگیر کە دەیتوانی کاربکات بۆ پێناسەکردنی پانەپەتا کە چییە و چی دەبێت. ئەوەیان خستەڕوو کە پانەپەتا دەبێت ئەم هەشت مەرجەی تێدابێت:

*گرتنەوەی ناوچەیەکی جوگرافی بەرفراوان.

* گواستنەوە و جووڵانی نەخۆشییەکە لە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی دیکە.

*زۆر توشکردن و تەقینەوەی نەخۆشییەکە.

*سنووورداری بەرگری لەشی خەڵکی بۆ نەخۆشییەکە.

*نوێی و تازەیی نەخۆشییەکە.

*فرە توندی نەخۆشییەکە.

*گرتنی نەخۆشییەکە بە هۆی وردە زیندەوەرەوە.

*گرتنی نەخۆشییەکە لە دەوروبەر و کەسانی دیکەوە.




**دەزگای رۆشنبیریی جەمال عیرفان**

**لەسەر ئەرکی (د. تەها ڕەسووڵ) چاپکراوە**

**2022**